# ڕۆمیۆ

## (( پەیمانی هاوڕێیان ))

چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی ڕێنمایی یە بۆ منداڵان

ئامادەکردنی:

سیما سابیر زەنگەنە

٢٠٠٩

## پێشکەشە بە :

- دایک و باوکی خۆشەویستم .
- هاوڕێیانی ئازیزم ( خەڵات، شیلان، سەمرە، دەریا) .
- سروش و ئاکام و سۆما و سرود و ئاکار.
- هەموو منداڵانی کوردستان .

## پێشەکی :

**بە لای منەوە لە ژیاندا لەو کەسە بەختەوەرتر نییە کە منداڵەکانی کچ بن یان کوڕ دەستبەرداری ڕێبازەکەی نەبن و لە خۆی زیاتر پەیامەکەی درێژە پێ بدەن. (سیما) کە هێشتا تەمەنی کەمتر لە (١٤) ساڵانە و بچوکترینی منداڵەکانمانە لەمێژە خولیای نووسینی هەیە و هەمیشە ئاواتی خزمەتکردنە لە بواری ڕۆشنبیریدا. ئەمەش نۆبەرەی ئەو خزمەتانەیەتی کە وای نیازە بە پێی دەرفەت درێژەیان پێ بدات و پێشان لە جیهانی هاوتەمەنەکانی خۆیەوە هەنگاوی ناوە . هیوا و خۆزگە خزمەتەکانی داهاتووی شان بە شان لەگەڵ تەمەنیدا باڵا بکەن...**

**باوکی سیما**
**جۆزەردان \ ٢٧٠٩**
**حوزەیران \ ٢٠٠٩**

# ڕۆمیۆ

## (چیرۆکی پەیمانی هاوڕێیان)



ساڵانێک لەمەوبەر کوڕێکی ئازا و ژیکەڵەی تەمەن (١٢) ساڵ هەبوو ناوی {ڕۆمیۆ} بوو، لەگەڵ خێزانەکەیدا لە گوندێکی بچوک و جواندا دەژیان، باوکی ڕۆمیۆ کێڵگەیەکی خنجیلانەی هەبوو، ڕۆمیۆ لە قوتابخانە نەبوو، لەبەر ئەوەی گوندەکەیان هیچ قوتابخانەیەکی تێدا نەبوو، هیچ کەسێکیش لەو گوندەدا خوێندەواری نەبوو.



ڕۆژێک منداڵانی گوندەکە بۆ پێشبڕکێ کۆکرانەوە و ڕۆمیۆ چووە لای باوکی و



داوای لێکرد کە ڕێگای بدات لەو پێشبڕکێیە بەشداری بکات و باوکیشی ڕازی بوو کاتێ پێشبڕکێکە کۆتایی هات ڕۆمیۆ سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بەم سەرکەوتنە ڕۆمیۆ و خێزانەکەی زۆر دڵخۆش بوون، بەڵام زۆری نەخایاند لە ناکاو هەواڵی سووتانی کێڵگەکەیانیان پێگەیشت و زۆر بە خێرایی خۆیان گەیاندە کێڵگەکە، بەڵام تا گەیشتنی ئەوان کێڵگەکە هەمووی سووتا بوو،کێڵگەکەیان لەلایەن ئەو پیاوە سووتێنرا بوو کە بە {پیاوە ڕەشەکە} ناسرابوو لە گوندەکەیاندا، چونکە پێشتر ئەو (پیاوە ڕەشە) داوای لە باوکی ڕۆمیۆ کردبوو لە بەرامبەر برە پارەیەکی زۆردا ڕۆمیۆی پێبدات بۆ ئەوەی بیبات بۆ شاری (میلانۆ) و لەوێ بیفرۆشێت بە خاوەنکارەکان بە برە پارەیەکی زیاتر، چونکە ڕۆمیۆ کوڕێکی زیرەک و چاپوک بوو لە گوندەکەیاندا. بەڵام باوکی ڕۆمیۆ ڕازی نەبوو بە داواکارییەکەی پیاوە ڕەشەکە، هەر بۆیە کێڵگەکەی ماڵی ڕۆمیۆی سووتاندبوو تا بەو کارەی ناچاریان بکات بە داواکارییەکەی ڕازی بن، باوکی ڕۆمیۆ بەهۆی ئەوەی زۆر هەوڵیدا ئاگری کێڵگەکەیان بکوژێنێتەوە، بەهۆی زۆری ئاگرەکە و دووکەڵەکەی هەردوو چاوی لەدەستدا.

باوکی ڕۆمیۆ بۆ چارەسەری چاوەکانی پێویستی بە پارەیەکی زۆر هەبوو، بەڵام ئەوان خێزانێکی هەژار بوون و ئەو پارە زۆرەیان نەبوو.



لەبەر ئەوە ڕۆمیۆ ڕازی بوو بۆ شاری میلانۆ بچێت بە مەرجێک پیاوە ڕەشەکە ئەو برە پارەیەیان بداتێ کە پێویستیان بوو

بۆ چارەسەری چاوەکانی باوکی، پیاوە ڕەشەکەش بەوە ڕازی بوو. هەر بۆیە ڕۆمیۆ پزیشکی هێنایە لای باوکی و پزیشکەکە مژدەی چاکبوونەوەی نزیکترین کاتی پێدان و بەم هەواڵە خێزانەکەیان شادمان بوون، بەڵام دایکی ڕۆمیۆ دڵخۆش نەبوو لەبەر ئەوەی بۆ ڕۆژی دواتر کوڕەکەی بەجێی ئەهێشت، بۆیە بڕیاریدا هەموو ڕاستیەکان بە ڕۆمیۆ بڵێت.

دایکی ڕۆمیۆ گوتی :کوڕی خۆم ڕاستیەک هەیە پێویستە پێتبڵێم،ئەویش ئەوەیە ئێمە دایک و باوکی ڕاستەقینەی تۆ نین بەڵکو کاتێ تۆ مناڵ بووی دایک و باوکت کۆچی دوایی یان کرد و ئەو پیاوەی کە ئێستا چاوەکانی لە دەستداوە (ڕۆبێرتۆ) تۆی لەسەر شەقامەکە دۆزیەوە و هێناتیەوە بۆماڵەوە و تۆی زۆر خۆش دەویست، ئەمە ڕاستیەکە بوو کە دەمویست پێتبڵێم.

ڕۆمیۆ (بە گریانەوە): { نا.. نا، ئێوە هەر دایک و باوکی منن، ئێوە منتان بەخێو کردووە} .

پاشان هەردووکیان چوونە ژوورەوە و ڕۆمیۆ ئەو شەوە لە ناو باوەشی دایکی خەوی لێکەوت.

بۆ بەیانی پیاوە ڕەشەکە گەیشتە لای ماڵی ڕۆمیۆ و بە دەنگێکی بەرز گوتی:{ڕۆمیۆ خێراکە میلانۆ شارێکی زۆر دوورە خێراکە بابڕۆین}، ڕۆمیۆش بە دایکی گوت:{دایە گیان دڵنیابە بەهاری داهاتوو دێمەوە} پاشان بە دەنگێکی بەرز و پڕ لە سۆز و خۆشەویستی هاواری کردوو گوتی:{خواتان لەگەڵ .. بە نیازی دیدار!} ڕایکردە ناو گالیسکەکەی پیاوە ڕەشەکەوە.

هەردووکیان بەڕێکەوتن بەرەو میلانۆ، کاتێک گەیشتنە گوندێک پیاوە ڕەشەکە بە ڕۆمیۆی گوت:{ من هەندێک ئیشم هەیە تۆ لێرە دابەزە، لە شاری لۆکاردۆ لە کارگەی پشیلە چاوەڕێت دەکەم، بەڵام هەرگیز بیر لە ڕاکردن نەکەیتەوە چونکە ئەگەر ڕابکەیت دایکت و باوکت دەکوژم} ڕۆمیۆ گوتی:{ باشە}، ڕۆمیۆ هەستی کرد شتێک لە ناو جاناتاکەیدا دەجوڵێتەوە کەسەیری کرد بینی ئاژەڵە بچوکەکەی لە ناو جانتاکەی دا هاتە دەرەوە،

ناوی ئەو ئاژەڵە {دیکۆرۆ} بوو ڕۆمیۆ زۆری خۆش دەویست هەربۆیە بڕیاری دا لەگەڵ خۆیدا بیبات.



ڕۆمیۆ کاتێ بە ڕێگادا ئەڕۆیشت سێوێکی بینی کە لەسەر شەقامەکە کەوتبوو لەبەر ئەوەی زۆری برسی بوو سێوەکەی هەڵگرتەوە بیخوات ئەو نەیزانی ئەو سێوە هی پیاوێک بوو کە سێوی ئەفرۆشت خاوەنی سێوەکان دەستی ڕۆمیۆی گرت و بە تووڕەییەوە پێی گوت:{بۆچی سێوەکانمت دزیوە؟ سەبەتەکە پڕ لە سێو بوو. کوانێ سێوەکانی تر تۆ دزی؟ دیارە لە لۆکاردۆ وە لە ژێر عارەبانەکەمدا خۆت حەشاردابوو و هەموو سێوەکانت خواردووە!!} ڕۆمیۆ زۆر پاڕایەوە کە ئەو دز نیە و سێوەکانی نەدزیوە،بەڵام خاوەن سێوەکان بڕوای پێ نەدەکرد، پاش کەمێک کوڕێک هات و گوتی:{ ئەم کوڕە بێتاوانە،ئێستا من بۆتان ئەسەلمێنم! پێڵاوەکانی بە قوڕن ئەمە مانای ئەوەیە کە لە ژێر باران ڕۆیشتووە، ئەگەر ئەو لە ژێر عارەبانەکە خۆی بشاردایەتەوە ئەوا پێڵاوەکانی ئاوها

بە قوورِ نەدەبوون، و ڕێگاکەش لە لۆکاردۆ وە تا ئێرە نیو کاتژمێرە کەس ناتوانێ بەم ماوە کەمە سەبەتەیەک سێو بخوات}، ئەو خەڵکەی لەوێدا بوون هەموویان دەیانگوت ئەو کوڕە ڕاست دەکات، پاشان خاوەن سێوەکان گوتی:{باشە ئەی کێ سێوەکانمی بردووە؟} کوڕەکەش گوتی:{ ئەوەی لە ژێر عارەبانەکەیە هەموو سێوەکانی بردووە} کاتێک سەیری ژێر عارەبانەکەیان کرد پیاوەکە هاواری کردو گوتی:
{ ئەمە کوڕەکەی خۆمە!!} پاشان بە ڕۆمیۆی گوت:{ زۆر داوای لێبوردنت لێ دەکەم کوڕی خۆم فەرموو ئەم دوو سێوە بگرە و بیخۆ ) ڕۆمیۆش بە ڕوویێکی خۆشەوە هەردوو سێوەکەی وەرگرت و ڕایکرد بە دوای ئەو کوڕەدا کە پشتگیری کرد پێی گوت:{ها ئەم سێوە بگرە و بیخۆ زۆر خۆشە} کوڕەکەش زەردەخەنەیەک گرتی و سێوەکەی لێ وەرگرت و پێکەوە ڕۆیشتن لە ناکاو کوڕەکە ڕاوەستا و ئاگادارییەکی خوێندەوە، ئاگادارییەکە سەبارەت بە خۆی و خوشکەکەی بوو، کاتێک ئاگادارییەکەی خوێندەوە زۆر تووڕە بوو و ئاگادارییەکەی لێکردەوە، سێوەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و ڕایکرد، ڕۆمیۆ سێوەکەی هەڵگرتەوە و بە دوایدا ڕایکرد تاکو گەیشتە لای و پێی گوت:{هانێ ئەوە سێوەکەتە تۆ بیخۆ زۆر خۆشە} کوڕەکەش گوتی:{ تۆ تەنها بۆ ئەم مەبەستە تاکو ئێرە بە دوامدا هاتی؟}، ڕۆمیۆ وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە بەڵام گوتی:{تۆ ناتەوێ ئەم سێوە بخۆی؟} کوڕەکەش پێکەنی و گوتی:{باشە دەیخۆم} ڕۆمیۆ گوتی:{من ڕۆمیۆم} کوڕەکە گوتی:{منیش ئەلفرێدۆم}.
دواتر ڕۆمیۆ بیری کەوتەوە کە پیاوە ڕەشەکە چاوەڕێی دەکات، لەبەر خۆیەوە گوتی:{ دەبێت مەخزەنی ئەو پیاوە بدۆزمەوە} ئەلفرێدۆ گوتی:{لەبەر چی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{پیاوێک لەوێ چاوەڕێم دەکات} ئەلفرێدۆ بە سەرسوڕمانەوە گوتی:{ تۆ بۆ میلانۆ دەچیت؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵێ ئەوە ڕاستە!} . ئەلفرێدۆ گوتی:{لە دوکەڵکێش پاککردنەوە کار دەکەی؟} ڕۆمیۆ گوتی :{بەڵێ !!بەڵام تۆ چۆنت زانی؟} ئەلفرێدۆ گوتی:{ئاخر منیش وەک تۆم!}، هەردووکیان بە سەر سوڕمانەوە سەیری یەکتریان کرد.

ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ لۆکاردۆ، لە ڕێگا ڕۆمیۆ پرسیاری زۆری لە ئەلفریدۆ دەکرد و ئەویش بەبێ تووڕە بوون وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دەدایەوە، لە ناکاو کوڕێکی شەڕانی جانتاکەی ئەلفریدۆی ڕفاند بە مەبەستی دزینی، رۆمیۆ و ئەلفریدۆش بە دوایدا ڕایان کرد تاکو کوڕەکە گەیشتە شوێنێک ڕێگای نەبوو بۆ هیچ شوێنێک بڕوات. هەر لەوێدا منداڵێکی تر پەیدا بوو لە منداڵەکە نزیک بۆوە کە جانتاکەی ئەلفریدۆی ڕفاندبوو پێی گوت :{ هەرچیت دزیوە لەگەڵمدا بەشی بکە ڕزگارت دەکەم} دزەکەش هیچ چارێکی نەبوو بۆیە ڕازی بوو، دوای ئەوەی کە کوڕەکە منداڵەکەی ڕزگار کرد، منداڵەی جانتاکەی ڕفاندبوو لە پەیمانەکەی پاشگەز بووەوە و پاڵێکی بە کوڕەکەوە ناو ڕایکرد، ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆش هەر بە دوایدا ڕایان دەکرد،کاتێک گەیشتنە سەر پردێک، کوڕەکەی کە پێشتر منداڵەکەی ڕزگار کردبوو گەیشتە منداڵەکەی جانتاکەی ڕفاندبوو و توانی جانتاکە لە منداڵەکە بسەنێتەوە و ویستی ڕابکات، بەڵام لەو کاتەدا ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ گەیشتنە لای کوڕەکە، ئەلفریدۆ بە ڕوویێکی خۆشەوە گوتی:{زۆر سوپاس هاوڕێکەم لەبەر ئەوەی یارمەتی منتداوە} کوڕەکەش هەستی بە شەرمەزاری کرد و بەسەر خۆیدا نەهێناو گوتی:{شایەنی نی یە هاورێکەم ئەمە ئەرکی سەر شانمە}، بەڵام لە ناکاو منداڵە شەڕانییەکە ڕایکرد و پاڵینا بە کوڕەکەوە جانتاکەی ئەلفریدۆ کەوتە ناو ڕوبارەکەوە، ئەلفریدۆ بە دڵتەنگیەوە سەیری ناو ڕووبارەکەی کرد ڕۆمیۆش حەزی نەدەکرد کە ئەلفریدۆ بە دڵتەنگی ببینێت هەربۆیە خۆی فڕێدایە ناو ڕوبارەکەوە و بە هەوڵێکی زۆر جانتاکەی هێنایە دەرەوە، ئەلفریدۆ بەمە زۆر دڵخۆش بوو، گوتی:{زۆر سوپاس ڕۆمیۆ گیان بەڕاستی نازانم چۆن سوپاست بکەم، لە ناو ئەم جانتایە شتێکی گرنگ هەیە کە لە هەموو ژیانم گرنگترە} ڕۆمیۆ بە زەردەخەنەوە گوتی:{ئەمە ئەرکی سەرشانمە ئەلفریدۆ گیان تۆ جارێک منت ڕزگار کرد لەوەی کە من تاوانبار کرابووم بە دزینی سێو ئێستاش پێویست بە سوپاس ناکات}

ئەلفریدۆ گوتی:{ پەیمانت دەدەمێ لەمەبەدوا هەمیشە یارمەتیت بدەم و بەرگریت لێ بکەم}.
پاشان ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ پێکەوە ڕۆیشتن بەرەو کارگەی پشیلە، کاتێک گەیشتنە کارگەکە پیاوە ڕەشەکە زۆر تووڕە ببوو لەبەر ئەوەی دواکەوتبوون لە کاتی دیاریکراو، لە کارگەکەدا کەسێکی تری لێبوو جگە لە پیاوە ڕەشەکە کە وا دیار بوو هاوڕێی بوو، پیاوە ڕەشەکە بە پیاوەکەی گوت:{ئەم دوو کوڕە ببە بۆ لای منالەکانی تر!}، کاتێک ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ چوونە ژوورەکەوە، پیاوەکە دەرگاکەی داخست و ڕۆیشت، گوێیان لە دەنگێک بوو گوتی:{ وەرنە ژوورەوە چیە دەڵێی دەترسن؟}
ڕۆمیۆ گوتی:{تۆ کێی؟}.

دەنگەکە گوتی:{دیارە نامناسیتەوە ئەی مەلەوان زانەکە؟} بینییان ئەو کوڕەیە کە جانتاکەی لە دزەکە وەرگرتبووەوە، ڕۆمیۆ گوتی:{ئەمە تۆی؟} کوڕەکە گوتی:{ئێمە چەند منداڵێکین پیاوە ڕەشەکە هەموومان دەبات بۆ میلانۆ} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە با هەموومان ببینە هاوڕێ، من ڕۆمیۆم و ئەمەش ئەلفریدۆی هاوڕێمە} کوڕەکە گوتی:{منیش دانکیم} پاشان گوتی:{پیاوە ڕەشەکە زۆر بێ بەزەییە و هەموومان دەبات بۆ پاککردنەوەی کورەی ماڵەکان و هەمیشە ماندوو و برسی دەبیین، ئێمە نابێ بهێڵین پیاوە ڕەشەکە بە ئاواتی خۆی بگات}.
پاشان دانکی گوتی:{من دەمەوێ هەڵبێم نامەوێ هەمیشە ماندوو و برسی بم وەرن بابەیەکەوە هەڵبێین} ڕۆمیۆ گوتی:{ئاخر من بەڵێنم بە پیاوە ڕەشەکە داوە من ناتوانم بێم لەگەڵتدا} دانکی گوتی:{کەیفی خۆتە دەی هاوڕێیان وەرن با بڕۆین}، پاشان ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ بە تەنها مانەوە .
پاش ماوەیەک پیاوە ڕەشەکە بە هاوڕێکەی گوت بڕوات بزانێت منالەکان چی دەکەن، کاتێک پیاوەکە چووە ژوورەکەوە بینی تەنیا ئەلفریدۆ لە ژوورەکەدا ماوە، پیاوەکە لە ئەلفریدۆ چووە پێشەوە و هاواری کرد و گوتی:{کوان منداڵەکانی تر؟} ئەلفریدۆ گوتی:{نازانم!، نازانم!}، لە ناکاو

یەکێک لە پشتەوە پاڵێکی بە پیاوەکەوە نا، ئەزانن ئەو کەسە کێ بوو؟ ڕۆمیۆ بوو!!، پاشان هەردووکیان هەڵاتن و خۆیان گەیاندە منداڵەکانی تر، کاتێ ئەوان لە کارگەی پشیلە چوونە دەرەوە زۆر دڵخۆش بوون بەڵام گوێیان لە دەنگێک بوو کە پێدەکەنی، لایان کردەوە بۆ پشتەوە بینییان پیاوە ڕەشەکەیە.

پیاوە ڕەشەکە یەکسەر هەموویانی کردە ناو بەلەمێکەوە و بەرەو میلانۆ بەڕێکەوتن، یەکێک لە پیاوانی گوندەکە زانیبووی پیاوەڕەشەکە بە نرخێکی کەم منداڵ دەکڕێت یاخود دەیان ڕفێنێت و بە نرخێکی زۆر زیاتر لە شوێنێکی تر دەیان فرۆشێتەوە دەیویست پۆلیس ئاگادار بکاتەوە،پیاوە ڕەشەکە بەمەی زانیبوو هەربۆیە بەبێ چاوەڕێ کردن لەگەڵ منداڵەکان بەڕێ کەوت بۆ میلانۆ، لە ڕێگا بە هۆی باران و شەپۆل و لافاوەوە بەلەمەکەیان تێکشکا بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆمیۆ مەلەوانێکی لێهاتوو بوو بڕیاری دا منداڵەکان ڕزگار بکات و بگاتە فریایان، ئەوە بوو یەکەم کەس ئەلفرێدۆی بینی هەڵیگرت و خستیە سەر پارچە تەختەیەکی بەلەمە شکاوەکە و پاشان کەسێکی تری بینی سەرەتا نەیزانی کێیە!! بەڵام ئەلفرێدۆ پێی گوت:{ئەوە پیاوە ڕەشەکەیە} ڕۆمیۆ ئەویشی هەڵگرت، بەڵام کەسی لە منداڵەکانی تر نەدۆزیەوە، ئەلفرێدۆ و ڕۆمیۆ پیاوە ڕەشەکەیان هەڵگرت و بە مەلەوانی و پاڵنانی تەختەشکاوەکە گەیشتنە وشکانی یەک، ڕۆمیۆ و ئەلفرێدۆ پیاوە ڕەشەکەیان هەڵگرت و بردیان بەرەو ئەشکەوتێک، ئەو شەوە پیاوە ڕەشەکە هەر خەوی بە ڕۆمیۆ وە دەبینی لەو کاتەی کە ڕۆمیۆ پیاوە ڕەشەکەی هەڵگرتبوو و بەرەو وشکانی دەبرد، ڕۆمیۆ و ئەلفرێدۆ تا درەنگ نەخەوتن و قسەیان دەکرد، ئەلفرێدۆ لە ڕۆمیۆی پرسی:{دەڕۆی بۆ میلانۆ؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بەلێ من بەڵێنم بە پیاوە ڕەشەکە داوە، چونکە پارەی پزیشکی باوکمی داوە} ئەلفرێدۆ گوتی:{هەر لەبەر ئەمە بوو پیاوە ڕەشەکەت ڕزگار کرد؟} ڕۆمیۆ گوتی:{نازانم، من بیرم لەوە نەکردبۆوە، بەڵام باوکم هەمیشە پێمی دەگوت کوڕی خۆم هەرگیز تۆ خۆت بە ئازا مەزانە بەرامبەر یەکێکی لاواز بەڵکو کاتێ خۆت بە ئازا

بزانە کە یارمەتی دوژمنەکەت دەدەی، من وام هەست دەکرد باوکم داوام لێ دەکات یارمەتی پیاوە ڕەشەکە بدەم}، ئیتر ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ قسەیان بۆ یەکتر دەکرد، ئەلفریدۆ گوتی:{ڕۆمیۆ گیان من پەیمانی هاوڕێیەتیت پێ دەدەم} ڕۆمیۆ گوتی:{هەروەها منیش پەیمانی هاورێیەتیت پێ دەدەم ئەلفریدۆ گیان}.

کاتی خۆرهەڵات و ڕۆژبووەوە پیاوە ڕەشەکە بە ئاگا هاتەوە زۆر بە سەرسامیەوە سەیری خۆی دەکرد و لەناکاو گوێی لە دەنگێک بوو کە دەنگی ئەلفریدۆ بوو پێی گوت:{سوپاس بۆ خوا کە تۆ سەلامەتی ڕۆمیۆ ژیانی ئێمەی ڕزگار کرد پێویستە پاداشتی خۆی وەرگرێت، گەورەم تکایە لەمەو دوا بە ڕەقی مامەڵە لەگەڵ ڕۆمیۆ مەکە}، پیاوە ڕەشەکە هەستا و گوتی:{ئیوە هەر لێرە بمێننەوە کەمێکی تر دەگەڕێمەوە} ئینجا ڕۆیشت و پاش کەمێک بە سواری گالیسکەیەکەوە هاتەوە، ڕۆمیۆ و ئەلفریدۆ و پیاوە ڕەشەکە بەرەو میلانۆ بەرێکەوتن.
کاتێک گەیشتنە میلانۆ لە مەی خانەی میلانۆ ڕاوەستان و مامۆستایانی دووکەڵکێش پاککردنەوە هاتن، یەکێکیان کە ناوی بەڕێز ڕۆسی بوو ڕۆمیۆی هەڵبژارد و پیاوێکی ناشرین و درندەش ئەلفریدۆی هەڵبژارد، ڕۆمیۆ پەیمانی بە ئەلفریدۆ دا کە هەر چەند لە توانایدا هەبوو هەوڵ دەدات بیدۆزێتەوە، پیاوە ڕەشەکە هەر یەکێکیانی بە هەشتا و پێنج هەزار دینار دا.



ئینجا بەڕێز ڕۆسی و ڕۆمیۆ ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی بەڕێز ڕۆسی، خاتوو ئیدا کە ژنێکی زۆر تووڕە و ڕەزیل بوو،



سەیری ڕۆمیۆی کرد و بە بەڕێز ڕۆسی گوت:{ئەم کوڕە لاسارەت بە چەند کڕی؟} ئەویش بە ترسەوە گوتی:{بە هەشتاو پێنج هەزار دینار} ژنەکە زۆر تووڕە بوو هەرچی بە زاریدا هات گوتی، لە ناکاو منداڵێک بە ناوی {ئەنجلیۆ} کە کوڕی بەڕێز ڕۆسی بوو هاتە ژوورەوە و گوتی:{دایە گیان باوە گیان بۆچی بە هێمنی گرفتەکانتان چارەسەر ناکەن؟ بەڵێنم بدەنێ کە چیتر ئەمە دووبارە نەکەنەوە) بەڕێز ڕۆسی و ژنەکەی گوتیان:{ئای کوڕی شیرینم تۆ ڕاست دەکەی بەڵێن بێت جارێکی تر دووبارەی ناکەینەوە} لە ڕاستیدا ئەنجلیۆ کوڕێکی باش نەبوو بەڵام بۆ ئەوەی لەبەر چاوی دایک و باوکی خۆی وا نیشان بدات ئەو ڕەفتارانەی دەکرد، بەڵام خاتوو ئیدا بڕیاری دا ئەو ڕۆژە خواردن نەدات بە ڕۆمیۆ، بە بەڕێز ڕۆسی گوت:{هەستە ئەم کوڕە ببە بۆ ژوورەکەی خۆی}، ژوورەکەی ڕۆمیۆ شوێنێکی تاریک بوو دەرگاکەشی ئاسن بوو و لە دەرگای زیندان دەچوو، ڕۆمیۆ چووە ژوورەکەیەوە و بەڕیز ڕۆسی دەرگاکەی لەسەر کلیل دا، ڕۆمیۆ ئەو شەوە بە برسێتی خەوت.

بۆ بەیانی بەڕێز ڕۆسی و ڕۆمیۆ چوون بۆ کارکردن، بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ڕۆمیۆ ئێستا فێری کارکردنت دەکەم، ئەم شەقامە جێگای کارکردنی ئێمەیە و بەم شێوەیە بە دەنگێکی بەرز دەڵێی: دوکەڵکێش پاک دەکەینەوە.. دوکەڵکێش پاک دەکەینەوە..} ڕۆمیۆ بە دەنگێکی نزم گوتی:{دوکەڵکێش پاک دەکەینەوە!؟} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ئای لەو دەنگە! خۆ خەریکە خەوم لێ دەکەوێ دەنگت بەرز بکەرەوە تا بگاتە لادێکەتان!!} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە} ئینجا چووە ناوەڕاستی شەقامەکە و بە دەنگێکی زۆر بەرز هاواری کردو گوتی:{دوکەڵکێش پاک دەکەینەوە...} لەو کاتەدا یەکێک بانگی کردن دوکەڵکێشەکەیان بۆ پاک بکەنەوە، ڕۆمیۆ زۆر بە وریاییەوە دوکەڵکێشەکەی پاک کردەوە.

ئێوارە ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە ڕۆمیۆ چووە ژوورەکەی خۆی بینی سەندوقێک لە ژوورەکەی دانرابوو ڕۆمیۆ سەندوقەکەی کردەوە بینی دوو پارچە کێکی تێدا بوو ڕۆمیۆ سەیری ژوورەکەی بەرامبەری کرد،تێگەیشت ئەو کچە بۆی داناوە کە لەماڵی بەڕێز ڕۆسی دایە، ڕۆمیۆ بە دڵخۆشیەوە لەگەڵ دیکۆرۆ (ئاژەڵەکەی) دانیشت و کێکەکەیان خوارد پاشان خەوتن.
بۆ بەیانیش دووبارە بەڕێز ڕۆسی و ڕۆمیۆ چوونەوە بۆ سەر ئیشەکەیان، بەڵام ئەمجارە کە ڕۆمیۆ لە سەر دوکەڵکێشەکە هاتە خوارەوە خاوەنی ئەو ماڵە کە ناوی دکتۆر کاستێلا بوو پەرتووکێکی بە دیاری دایە ڕۆمیۆ، ڕۆمیۆ بەدڵتەنگیەوە گوتی:{من خویندەواریم نییە!} دکتۆر کاستێلا گوتی:{باشە وەرە من ئەم ڕستەیە لە پشتی پەرتووکەکەت دەنوسم، ئەمە نوسراوە ناوت چییە؟ ئەم ڕستەیەش نووسراوە من ناوم ڕۆمیۆیە، ڕۆمیۆ گیان تۆ هەر کاتێک پێت خۆش بوو وەرە بۆ لام و من چەند وشەیەکی ترت فێر دەکەم} ڕۆمیۆ پێکەنی و گوتی:{زۆر سوپاس دکتۆر گیان} ئینجا پەرتووکەکەی لێ وەرگرت، ئێوارە کە ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە ڕۆمیۆ چووە ژوورەکەی خۆی دووبارە سەندوقێکی تری بینی و ئەویش سەندوقەکەی کردەوە چەند دیارییەکی تێدا بوو لەگەڵ نامەیەک، ڕۆمیۆ نامەکەی هەڵگرت و کردیەوە، نەیزانی سەرەتاکەی بخوێنێتەوە بەڵام ڕستەکەی کۆتایی لەو ڕستەیە دەچوو کە دکتۆر کاستێلا بۆی نووسی بوو، خاوەنی نامەکە دەیویست ناوی ڕۆمیۆ بزانێت، ڕۆمیۆ دەستی دایە پارچە لاپەڕەیەک و قەڵەمێک و ئەو ڕستەیەی نووسی کە دکتۆر کاستێلا نووسیبووی (من ناوم ڕۆمیۆیە) پاشان بە هۆی دارێکی درێژەوە کلیلی دەرگاکەی هێنا و چووە دەرەوە لە ژوورەکەی و نامەکەی خۆی لە ژێر دەرگاکەوە کردە ژووری کچەکەوە و هێشتا ڕۆمیۆ نەڕۆیشتبۆوە بۆ ژوورەکەی خۆی کچەکە لە ژێر دەرگاکەیەوە نامەیەکی تری کردە دەرەوە بۆ ڕۆمیۆ و ڕۆمیۆش هەڵیگرتەوەو ڕۆیشتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و خەوت.

بۆ بەیانی کە ڕۆمیۆ و بەڕێز ڕۆسی چوونە سەر ئیشەکەیان لە ڕێگا ڕۆمیۆ دکتۆر کاستێلای بینی، خۆی لە بەڕێز ڕۆسی دزیەوە و ڕایکرد بەرەو لای دکتۆر کاستێلا و پێی گوت:{ئەم کاتەت باش دکتۆر. تکایە ئەم نامەیەم بۆ بخوێنەرەوە!} دکتۆر کاستێلا گوتی:{باشە، .. دەستیکرد بە خوێندنەوەی نامەکە بۆ ڕۆمیۆ : (هەر کە یەکەم ڕۆژ هاتیتە ماڵمان من تۆم دیت هەروەها تۆم دەبینی کاتێک بۆ کارکردن دەڕۆیشتی، بەڕاستی کوڕێکی ژیر و چاک دیاریت بەلام ئەوان زۆر بە خراپی مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن ..تکایە ناوی خۆتم پێ بڵێ}. هەر ئەوەندە نووسرابوو لە نامەکەدا، ئینجا ڕۆمیۆ گوتی:{زۆر باشە تکایە ئەم نامەیەش!!} دکتۆر کاستێلاش نامەکەی بۆ خوێندەوە:{ڕۆمیۆ من زۆر سوپاست دەکەم کە ناوی خۆت بۆ ناردم هیوادارم بتبینم و سەربوردەی ژیانت بزانم چونکە زۆر بە پەرۆشم بیزانم تکایە هەوڵ بدە بێیتە ژوورەکەم و بمبینی.} ڕۆمیۆ بە سەرسوڕمانەوە سەیری دکتۆر کاستێلای دەکرد و لەناکاو ڕۆمیۆ بینی کە بەڕێز ڕۆسی بە بۆڵەبۆڵ کردنەوە بەرەو لای دێت، بە دکتۆر کاستێلای گوت:{ توخوا با ئەمە نهێنی بێت لە نێوانمان بەڵێنم پێبدە تکایە!} دکتۆر کاستێلا گوتی:{ بەدڵنیاییەوە بەڵێنت پێدەدەم} پاشان ڕۆمیۆ لەگەڵ بەڕێز ڕۆسی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێک شەو داهات ئەندامانی ئەو ماڵە خەوتن کە ڕۆمیۆ لێی دەژیا، ڕۆمیۆ بە هۆی دارە درێژەکەوە کلیلی دەرگاکەی هێنا و ڕۆیشت و لە دەرگای ژوورەکەی کچەکەی دا، کچەکە گوتی:{فەرموو!} ڕۆمیۆ دەرگاکەی کردەوە بینی کچێک لەسەر سیسەمەکە دانیشتبوو، فەرمووی لە ڕۆمیۆ کرد و پێی گوت:{وەرە ژوورەوە..تکایە دەرگاکە دابخە.. بێ زەحمەت چراکەش داگیرسێنە..} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە بەسەر چاو..} پاشان کچەکە گوتی:{ بۆ وا شڵەژاوی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{...نا.!!من ؟..ئاخر ......} قسەی بۆ نەدەکرا، کچەکە دەستی کردە پێکەنین و ڕۆمیۆش لەگەڵیدا پێکەنی، کچەکە گوتی:{زۆر باشە ڕۆمیۆ فەرموو لێرە دانیشە، زۆر سوپاست دەکەم کە ناوی خۆت بۆ ناردم} ڕۆمیۆ گوتی:{نا. من زۆر



سوپاست دەکەم بۆ دیاری و نامەکانت} کچەکە گوتی:{من زۆر دڵخۆشم بە هاوڕێیەتی تۆ، ئێستا هەست دەکەم کەسێک هەیە وەڵامم دەداتەوە و گوێم لێ دەگرێ، من ناوم ئەنجێلیتایە. پێخۆشحاڵم بە ناسینت} ڕۆمیۆ گوتی:{هەروەها منیش پێخۆشحاڵم بە ناسینت} بەڵام کاتێک تەوقەی لەگەڵدا کرد، ڕۆمیۆ زۆر بە خێرایی دەستی گەڕاندەوە و بەسەرسوڕمانەوە گوتی:{دەستت زۆر زۆر گەرمە!!} ئەنجێلیتا گوتی:{من هەمیشە پلەی گەرمی لەشم بەرزە، هەر لەبەر ئەوەش دکتۆرەکەم گوتی لە ژوورەکەی خۆت دەرمەچۆ، ڕۆمیۆ من لەم ژوورەدا بێزارم هەمیشە هەست بە ناخۆشی و دڵتەنگی دەکەم} پاشان گوتی :{ڕۆمیۆ من هەمیشە چاودێریم دەکردی و هەندێک وێنەی تایبەتیشم بۆ دروست کردووی . ئەها،، سەیری بکە} ڕۆمیۆ گوتی:{ئەمانە زۆر لە من دەچن!، تۆ زۆر دەسترەنگینی..} ئەنجێلیتا گوتی: ( هەر کاتێک سەیری تۆم دەکرد دوعام بۆ دەکردی هەمیشە دەم بەخەندە بیت و پێبکەنیت ..توخوا هەمیشە پێبکەنە، ڕۆمیۆ من بە پێکەنینی تۆ بەهێز دەبم و زیاتر بە هیوا دەبم و خۆ ڕاگر دەبم.} ئینجا بۆ ماوەیەک هەردووکیان بەبێ دەنگی مانەوە، پاشان قسەی زۆریان کرد، ئەنجێلیتا داوای لە ڕۆمیۆ کرد وێنەی ئاسمان و هەورەکانی بۆ بکات و دەفتەری وێنەکەی خۆی پێدا، پاشان ڕۆمیۆ بە دڵخۆشیەوە گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، بۆ بەیانی ڕۆمیۆ بە پێکەنینەوە خۆی ئامادە کرد و

دەفتەری وێنەکەی ئەنجیلیتای لەگەڵ خۆیدا برد، بەڵام ئەنجلیۆ دەفتەری وێنەکەی بەدەستی ڕۆمیۆ وە بینی، پاشان ڕۆمیۆ و بەڕێز ڕۆسی چوون بۆ سەر ئیشەکەیان، ئەنجلیۆ ڕۆیشت بۆ لای هاوڕێکانی، دوای ئەوەی هەندێک لە منداڵەکان ڕۆیشتن ئەنجلیۆ پێی گوتن:{کوڕێک لە ماڵماندا ئیش دەکات، وابزانم نهێنی دەشارێتەوە، دەبێ بزانین ئەو نهێنییە چییە!!} یەکێک لە منداڵەکان ناوی {نیکیتا} بوو گوتی:{ئەمە زۆر خۆشە} نیکیتا کوڕێکی چاو شین بوو و شێوەی لە کچێکی جوان دەچوو، یەکێکی تریان ناوی {ڕیۆ} بوو گوتی:{من ڕازیم} ڕیۆش کوڕێکی کەمێک کورتە باڵا بوو هەروەها {پۆتینۆ} کوڕێکی زۆر قەڵەو بوو گوتی:{منیش ڕازیم. با بڕۆین} ئەم منداڵانە ناوی کۆمەڵەکەیان نابوو ( دەستەی گورگەکان) .پاشان بەیەکەوە فیڵێکیان دانا و بەڕێ کەوتن بەرەو لای ڕۆمیۆ.

ڕۆمیۆ کوورەی زۆری پاککردبۆوە بۆیە وەستاکەی ڕێگەی پێدا بوو پشوو بدات ئەویش لە کاتی پشوودانیدا وێنەی ئاسمان و هەورەکانی دەکێشا، بەڵام لە ناکاو گوێی لە دەنگێک بوو کە هـاواری دەکرد و دەیگوت(( فریام کەون)) ڕۆمیۆ بینی کوڕێک دەیەوێت سێوەکانی لێ ببات بە زۆر. ڕۆمیۆ ڕایکرد بۆئەوەی فریای کچەکە بکەوێت،، بەڵام کچەکە هاواری کرد گوتی:{کوڕەکە سەیرکە. ئەو منداڵە دەفتەرەکەتی برد!!} ئەو کوڕەی کە دەفتەرەکەی ڕۆمیۆی بردپۆتینۆ بوو، ڕۆمیۆ بەدوای پۆتینۆ دا ڕایکرد وکاتێک نزیک بۆوە لێی،، پۆتینۆ هاواری کرد گوتی:{نیکیتا. وەرە} نیکیتا لەسەر پلیکانەکان ڕاوەستا بوو بە ڕۆمیۆی گوت:{دەفتەرەکەت لای منە ئەگەر ئازای وەرە لێم وەرگرە} ڕۆمیۆ بەسەر پلیکانەکاندا سەر کەوت و بە نیکیتای گوت:{تکایە بمدەرەوە} بەڵام نیکیتا نەیدایەوە و هەڵیدا بەرەو بیناکەی ئەوبەر کە ئەنجلیۆ لەوێ بوو ڕۆمیۆ سەیری ئەنجلیۆی کرد گوتی:{ئەنجلیۆ! تۆ . تۆ بۆ؟} نیکیتا گوتی:{ئەویش یەکێکە لە دەستەی گورگەکان} ئەنجلیۆ گوتی:{ئەگەر ئازای وەرە وەریگرەوە....، ها ها ها ها... چیتر چاوت پێی ناکەوێتەوە}بەڵام ڕۆمیۆ باوەڕی بە خۆی هەبوو بۆیە یەکسەر خۆی هەڵدایە سەر بیناکەی ئەوبەر و بە دوای ئەنجلیۆدا

ڕایکرد، بەڵام بە داخەوە ئەنجلیۆ ڕاستی کرد کە گوتی چیتر چاوت پێی ناکەوێتەوە لەبەر ئەوەی کاتێ ڕۆمیۆ دەیویست لە ئەنجلیۆی بستێنێتەوە دەفتەرەکە کرایەوە و هەموو پەڕەکانی لێبوونەوە و بە هەوادا ڕۆیشتن، ئیتر ڕۆمیۆ لە گریان زیاتر هیچی بۆ نەمایەوە.
کاتێک ڕۆمیۆ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ڕاستی مەسەلەکەی بۆ ئەنجێلیتا گێڕایەوە، بەڵام ئەنجێلیتا هیچ دڵتەنگ نەبوو پاشان ڕۆمیۆ پەڕی باڵندەیەکی دایە ئەنجێلیتا کە لە کاتی فڕیندا لێی کەوتبوو، ئەنجێلیتا بەمە زۆر دڵخۆش بوو، بۆ بەیانی دووبارە کاتێک ڕۆمیۆ و وەستاکەی چوونە سەر ئیشەکەیان ڕۆمیۆ چووە سەر کوورەی ماڵێک، گوێی لە دەنگە دەنگێک بوو چەند منداڵێک بوون بە دوای نیکیتا دا ڕایان دەکرد ڕۆمیۆ سەیری کرد بینی نیکیتا ڕێگەی لێ گیراوە و لە هەرچوار لاوە منداڵ دەوریان لێدابوو یەکێک لە منداڵەکان گوتی:{ئەمە کۆتایی تۆ بوو ئیتر ڕێگات بۆ نەماوە} بەڵام لەناکاو کوڕێک هات و گوتی:{نا ئەمە کۆتایی ئەو نیە ئەمە کۆتایی ئێوەیە} یەکێک لە منداڵەکان گوتی:{تۆ کێی؟} کوڕەکە گوتی:{ئەگەر من ناناسن ئەوا من لیۆناردۆم و لە دەستەی گورگەکانم} کوڕێکی تر لە دەستەی گورگەکان هات و گوتی:{منیش تاسیۆنیم ناسراوم بە وەحشەکە} یەکێکی تریان گوتی:{هەروەها منیش ڕیۆم و یەکێکم لە ئەندامانی دەستەی گورگەکان و ئەمەش پۆتینۆیە} ئاماژەی بۆ کوڕە قەڵەوەکەی نزیکی کرد،ئەوی تریان گوتی:{ئەگەر ئەتانەوێ من بناسن من نیکیتام} پاشان ئەوانەی کە بەدوای نیکیتا کەوتبوون گوتیان:{ئێمەش دەستەی دووپشکین} ئینجا شەڕ دەستی پێکرد لە نێوان دەستەی گورگەکان و دەستەی دووپشکەکان، دوای ماوەیەک دەستەی گورگەکان خەریک بوون شکست بهێنن بەڵام لە ناکاو کوڕێک فریایان کەوت،منداڵەکانی دەستەی گورگەکان بە دڵخۆشیەوە هاواریان کرد گوتیان:{ئەوە جیۆڤانی هات} ... جیۆڤانی سەرکردەی دەستەی گورگەکان بوو بۆیە کاتێک ئەو هات گورگەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا
ئەنجلیۆ کەلە پشت دیوارەکەوە ڕاوەستا بوو بە ڕاکردن هات و بە هەناسە

برکێوە گوتی:{ئێستا لە ڕێگا توشی هەندێک لە دووپشکەکان بووم و زۆریان لێدام منیش تەنیا توانیم بە زۆر ئەم کڵاوەیان لێ برفێنم }.
ڕۆمیۆ گوێی لە هەموو قسەکان بوو خراپی ئەنجلیۆی بۆ دەرکەوت، ئیتر دەستەی گورگەکان ڕۆیشتنەوە بۆ شوێنە تایبەتیەکەی خۆیان، جیۆڤانی گوتی:{ئادەی ئەنجلیۆ بەسەرهاتی خۆتمان بۆ بگێڕەوە} ئەنجلیۆ پێکەنی و گوتی:{باشە... کاتێ من تەمەنم سێ ساڵ بوو دایک وباوکم لە جەنگدا کوژران لەو ڕۆژەوە بەتەنیا و بێخاوەن ماومەتەوە و ڕقم لە هەموو کەسێک بووەوە، زۆر ئازارم خوارد پاشان کەوتمە دەستی چەتەکان دواییش ئەم نیشانەیەیان لەسەر قۆڵم بەجێ هێشت}نیشانەیەکی لەسەر قۆڵی نیشانی منداڵەکاندا، جیۆڤانی پێی گوت:{ئەنجلیۆ ئەگەر هەر لەسەر فێڵەکانت بەردەوام بیت ئەوا ئەتکەم بە یارمەتیدەری سەرەکی خۆم} ئەنجلیۆ زۆر بە خۆشحاڵیەوە پێکەنی و گوتی( باشە )، بەڵام لەبەر ئەوەی جیۆڤانی یەکەمجار پەیمانی بە تاسیۆنی دابوو کە بیکات بە یارمەتیدەری سەرەکی خۆی لە دەستەکەیاندا چونکە تاسیۆنی کوڕێکی زۆر ئازا بوو، بۆیە تاسیۆنی دڵی لە جیۆڤانی شکاو لەو ڕۆژەوە ڕقی لە ئەنجلیۆ بوەوە.
ڕۆمیۆ کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە هەموو بەسەرهاتەکەی کە بینیبووی بۆ ئەنجێلیتای گێڕایەوە و پێی گوت:{ئەنجلیۆ لە منداڵەکانی دەستەی گورگەکان خراپترە}، بەڵام ئەنجلیۆ گوێی لە دەنگی ڕۆمیۆ بوو کە لەگەڵ ئەنجێلیتا قسەی دەکرد ئەنجلیۆ پێکەنی لە دڵی خۆیدا گوتی:{ ها ها ها بۆ خۆتان بە کەیفی خۆتان قسە بکەن}ئینجا ڕۆیشت و گرنگی پێنەدان، ڕۆمیۆ بە ئەنجێلیتای گوت:{ئەنجێلیتا فێری خوێندنەوە و نوسینم دەکەی؟} ئەنجێلیتاش گوتی:{باشە. پێتچۆنە لە ڕێگەی نامە نوسینەوە فێرت بکەم؟ هەر ڕۆژەو تەنها دێڕێکت بۆ دەنوسم..} ڕۆمیۆ گوتی:{زۆر باشە} . دواتر گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی و خەوت.
بۆ بەیانی کاتێ ڕۆمیۆ خەریکی پاککردنەوەی ژوورێکی ماڵی بەڕێز ڕۆسی بوو خاتوو ئیدای ژنی ڕۆسی و ئەنجلیۆی کوڕی لەوێ بوون

.دایکی ئەنجلیۆ لە ئەنجلیۆی پرسی:{کوڕی خۆم خۆ ئێستا لەگەڵ دەستەی گورگەکان قسە ناکەیت!} ڕۆمیۆ سەیری ئەنجلیۆی کرد و ئەنجلیۆش سەیری ڕۆمیۆی کرد، پاشان ئەنجلیۆ گوتی:{نا دایە گیان ئەوانە دز و جەردەن و شەڕانگێزن من چۆن قسە لەگەڵ ئەو خراپەکارانە دەکەم!!} دایکیشی گوتی:{ئەی ئافەرین کوڕە باشەکەم}.
کاتێک دایکی ئەنجلیۆ ڕۆیشت ڕۆمیۆ ڕووی کردە ئەنجلیۆ و گوتی:{تۆ لەگەڵ دایکت درۆت کرد!!} ئەنجلیۆ بە غەمبارییەوە گوتی:{ڕۆمیۆ من بۆئەوەی لە پێش دایکم باش بم درۆ دەکەم، بەڵام تۆش درۆ لەگەڵ دایکم دەکەیت، ڕۆمیۆ دڵنیابە ئەم نهێنیەت ئاشکرا ناکەم، ئەنجێلیتا هاوڕێیەکی لە تۆ باشتری دەست ناکەوێت}. ڕۆمیۆ بە ترسەوە گوتی:{تۆ چۆن ئەمەت زانی؟} ئەنجلیۆزەردەخەنەیەک گرتی و گوتی:{پەیمانت پێ دەدەم کە ئەم نهێنیەت ئاشکرا ناکەم تۆش پەیمانم پێ بدە کە بە دایکم و باوکم نەلێی من هاوڕێیەتی دەستەی گورگەکان دەکەم} ڕۆمیۆ بە دڵخۆشیەوە گوتی:{پەیمانت دەدەمێ، من خۆشحاڵم بە هاوڕێیەتی تۆ}پاشان ڕۆمیۆ بە دڵخۆشیەوە ڕۆیشت بۆ لای ئەنجێلیتا و بۆی باس کرد. پێی گوت:{ئەنجلیۆ کوڕێکی باشە} ئەنجێلیتا پێکەنی، ئینجا نامەکەی دایە ڕۆمیۆ و لەو کاتەدا بەڕێز ڕۆسی بانگی ڕۆمیۆی کرد کە بچن بۆ سەر ئیشەکەیان، ڕۆمیۆ بە ڕاکردن ڕۆیشت، کاتێ ئەنجێلیتا سەیری دەفتەرەکەی کرد بینی نامەکەی کە بۆ ڕۆمیۆی دانابوو هەر لەجێگای خۆی بوو بەڵکو نامەیەکی تری بە هەڵە دابوو بە ڕۆمیۆ، بەڵام تازە ڕۆمیۆ ڕۆیشت، ڕۆمیۆ لە کاتی پشوودا دانیشت هەتاکوو نامەکە بخوێنێتەوە بەڵام کاتێ سەیری نامەکەی کرد بە دڵتەنگیەوە گوتی:{ئەم هەموو نوسینە چییە! ئێمە لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە هەر ڕۆژە و دێڕێکم بۆ بنوسێت!!}، لەو کاتەی کە ڕۆمیۆ سەیری نامەکەی دەکرد ئەنجلیۆ و پۆتینۆ و ڕیۆ لە پشت پردەکەوە ڕاوەستابوون، ئەنجلیۆ گوتی:{من دەچم بە فێڵێک نامەکەی لێ دەفڕێنم} ئەوانیش گوتیان باشە، ئەنجلیۆ هاتە لای ڕۆمیۆ گوتی:{ها ڕۆمیۆ ئەوە تۆی؟ چۆنی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{ئەنجلیۆ تۆ چۆنی؟} ئەنجلیۆ گوتی:{باشم...ئەو نامەیە هی

ئەنجێلیتایە؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵێ... ئێستا دەبێ بڕۆم} نامەکەی کردە گیرفانی چاکەتەکەیەوە و لەسەر پلیکانەکان داینا هەتاکوو بچێت شتەکانی هەڵبگرێت بەڵام ئەنجلیۆ نامەکەی لە گیرفانی چاکەتەکەی ڕۆمیۆ دەرهێنا و چاکەتەکەی هەڵدایە سەر گالیسکەیەک و گوتی:{ڕۆمیۆ! ڕۆمیۆ ! ئەو گالیسکەیە چاکەتەکەتی دزی خێراکە با بچین لێی وەرگرینەوە}، ڕۆمیۆش بە دوای گالیسکەکەدا ڕای کرد، ئەنجلیۆ گوتی:{ڕۆمیۆ من بەم کۆڵانەدا دەڕۆم} ڕۆمیۆ گوتی:{زۆر سوپاس ئەنجلیۆ} بەڵام ئەنجلیۆ بە دوای گالیسکەکەدا ڕاینەدەکرد بەڵکو لە کۆڵانەکەدا بە ڕۆمیۆ پێدەکەنی پاشان پۆتینۆ و ڕیۆ هاتن بۆ لای ئەنجلیۆ و پێکەوە گەڕانەوە بەرەو شوێنە نهێنیەکەیان، لەولایشەوە ڕۆمیۆ چاکەتەکەی لە خاوەنی گالیسکەکە وەرگرتەوە.

کاتێک ئەنجلیۆ ڕۆیشت بۆ لای دەستەکەیان، بۆ جیۆڤانی و هاوڕێکانی بەسەرهاتەکەی بۆ باسکردن زۆر پێکەنین بەڵام تاسیۆنی پێنەدەکەنی و بە ئەنجلیۆی گوت:{ئەی کوانێ نامەکە زووکە بمدەرێ} ئەنجلیۆش نامەکەی لە گیرفانی دەرهێنا جیۆڤانی گوتی:{نیکیتا بیخوێنەوە} نیکیتا نامەکەی کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکە:{من لێرەدا نهێنیەک دەشارمەوە کەسیش نایزانێ، من نهێنیەکانم نانوسم بەڵام باسی خوڕەوشتی خراپی ئەنجلیۆ دەکەم، ئەنجلیۆ هەردەم لەگەڵ هاوڕێکانی درۆ دەکات و دەڵێت دایک و باوکم مردوون...} ئەنجلیۆ بەخێرایی ڕایکرد بەرەو لای نیکیتا و هاواری کرد {بەسە چیتر مەیخوێنەوە} تاسیۆنی هەستا و ئەنجلیۆی گرت بە پێکەنینەوە گوتی:{ نیکیتا بەردەوام بە} نیکیتاش گوتی:{باشە، هەروەها دەڵێ ئەو نیشانەیەی لەسەر شانێتی بە هۆی چەتەکانەوە بووە بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەمە برینی پێش دوو ساڵە، هەروەها لای دایکی بە خراپە باسی دەستەی گورگەکان دەکات و دەڵێت ئەوان دز و منداڵی پیس و خراپن، منیش زۆر ڕقم لەو ڕەفتارە ناشرینانەی ئەنجلیۆیە} پاشان تاسیۆنی ئەمەی بە هەل زانی و زۆری لە ئەنجلیۆ دا و فڕێیان دایە کۆڵانێکەوە.

کاتێ ڕۆمیۆ و وەستاکەی دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە ڕۆمیۆ باسی ئەنجلیۆی بۆ بەڕێز ڕۆسی دەکرد دەیگوت:{ئەنجلیۆ کوڕێکی دڵپاکە} لە ناکاو ڕۆمیۆ و بەڕێز ڕۆسی ئەنجلیۆیان بینی لە کۆڵانێکدا کەوتبوو ..ڕۆمیۆ ڕایکرد بۆ لای ئەنجیلۆ و لێی پرسی:{کێ وای لێ کردووی؟} ئەنجلیۆ گوتی:{ڕۆمیۆ!.. تاسیۆنی یەکێکە لە ئەندامانی دەستەی گورگەکان و زۆر ڕقی لە دوکەڵکێش پاککەرەوەکانە بەڵام من بەرگریم لە تۆ کرد و گوتم ڕۆمیۆ هاوڕێمە، ئەوەتا لە لای پردەکە چاوەڕێت دەکات} ڕۆمیۆ ئەنجیلۆی جێهێشت و بە ڕاکردن ڕۆیشت بۆلای پردەکە، نیکیتا و ڕیۆ و پۆتینۆی بینیی، پێی گوتن:{کوا تاسیۆنی؟} ئەوانیش پێیان گوت کە لە ناو بەلەمەکەدایە، ڕۆمیۆ چووە ناو بەلەمەکەوە تاسیۆنی بینی لەوێ ڕاوەستا بوو و گوتی:{ئەوە بۆچی لە ئەنجلیۆت داوە؟ جارێکی تر دەستی بۆ نەبەیت هەی زلە..} تاسیۆنی گوتی:{ڕۆمیۆ ئەگەر ئازایت وەرە با شەڕ بکەین} ئینجا دەستیان کردە شەڕ کردن ئەنجلیۆ چوو بە دوو پۆلیسی گوت:{ئەندامانی دەستەی گورگەکان لەناو ئەو بەلەمەکەدا کۆبونەوە دەکەن}، کە پۆلیسەکان چوونە بەلەمەکەوە بینییان تاسیۆنی لە ڕۆمیۆ دەدات کاتێ تاسیۆنی و منداڵەکانی تر پۆلیسەکانیان بینی یەکسەر هەڵاتن، ڕۆمیۆ زۆر سوپاسی پۆلیسەکانی کرد کە لە کاتێکی گونجاودا هاتن، ئینجا بەڕێکەوت بەرەو ماڵەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی لەو ماوەیەی کە ڕۆمیۆ لە ماڵەوە نەبوو ئەنجلیۆ بە دایکی گوتبوو ڕۆمیۆ یەکێکە لە ئەندامانی دەستەی گورگەکان و ئەوان لێیانداوە دایکی ئەنجلیۆ بەمە زۆر تورە بوو چاوەڕێی دەکرد ڕۆمیۆ بگەڕێتەوە و سزای بدات، ئەنجێلیتا گوێی لەو قسانە بوو زۆر نیگەران بوو هەربۆیە پلەی گەرمی لەشی زۆر بەرز ببۆوە، کاتێک ئەنجێلیتا دەیویست بگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی لای دەرگاکە بینی ئەنجلیۆ جانتاکەی ڕۆمیۆی بەدەستەوەیە و خەریکە ئەو پارەیەی کە دایک و باوکی کۆیان کردبۆوە دەیکاتە ناو جانتاکەی ڕۆمیۆ وە، پاشان ئەنجیلۆ کە هەموو پارەکەی تێکرد هاواری کرد و گوتی:{دایکە باوکە. وەرن سەیری ئێرە بکەن!} جانتاکەی ڕۆمیۆی کردەوە و گوتی:{سەیری ئەو هەموو

پارەیە بکەن!!} دایکی ئەنجلیۆ ڕۆیشت سەیری پارەکەی خۆیانی کرد کە کۆیان کردبۆوە بینیان هیچی لێ نەمابوو، دایکی ئەنجلیۆ گوتی:{ئەم کوڕە هەموو پارەکانی ئێمەی دزیوە!!، من هەر لە یەکەمجارەوە دەمزانی ئەم کوڕە دزە} ئەنجێلیتا هاتە دەرەوە لە ژوورەکەی خۆی و گوتی:{نا. نا. ئەمە ڕاست نییە.....} بەڵام قسەکانی پێ تەواو نەکرا کەوتە سەر زەوی، بەڕێز ڕۆسی بە پەلە ڕۆیشت پزیشکی هێنا لەو کاتەدا ڕۆمیۆش گەیشتەوە ماڵەوە، بەڕێز ڕوسی و ژنەکەی بە ڕەفتارێکی زۆر ناشرین مامەڵەیان لەگەڵ ڕۆمیۆ کرد و پێیان گوت تۆ دزیت، هەرچەندە ڕۆمیۆ دەیگوت من دز نیم بەڵام قسە کردن بێ سوود بوو پۆلیسیان ئاگادار کردەوە بەڵام پێش ئەوەی پۆلیس بگاتە ماڵیان ڕۆمیۆ هەڵات، لە ڕێگا دەستەی گورگەکان ڕێگەیان لە ڕۆمیۆ گرت تەنها نیکیتا لەگەڵیاندا نەهاتبوو، جیۆڤانی گوتی:{تۆ ترسنۆکی لەبەر ئەوەی پۆلیست هێنا بووە ناو بەلەمەکە} ڕۆمیۆ گوتی:{من ترسنۆک نیم و پۆلیسیشم نەهێنا بووە ناو بەلەمەکە بەڵکو ئەوان خۆیان پێیان زانی و هاتن}، ئەوان لەو قسانەدا بوون لەناکاو یەکێک جلێکی ڕەشی لەبەردا بوو دەموو چاوێکی زۆر سپی هەبوو هات و بە دەنگێکی ترسناکەوە گوتی:{لێرە بڕۆن! ئەو کوڕە لە ژێر چاودێری جادووشین دایە ئەگەر نا جادووشین خۆی دەزانێ چی دەکات} منداڵەکان هیچ نەترسان و گوتیان:{ئادەی بزانین چی دەکەی؟} ئەویش گوتی:{وادیارە جادوو شین کارەکەی کرد} پاشان خۆیدایە سەر ڕۆمیۆ دا و گوتی:{ئەوە پیاوانی پۆلیس هاتن سەیرکەن}ئینجا ئەوان سەیریان کرد هەتاکو بزانن پۆلیس لە کوێیە بەڵام هەتاکو ئەوان ئاوڕیان دایەوە جادوو شینەکە و ڕۆمیۆ دیار نەمابوون.

جادوو شینەکە و ڕۆمیۆ چوونە شوێنێک و خۆیان حەشاردا،جادوو شینەکە بەڕۆمیۆی گوت:{دەمێکە یەکترمان نەبینیوە هاوڕێ!} ڕۆمیۆ بەسەر سوڕمانەوە سەیری جادوو شینەکەی کرد و نەیدەزانی کێیە تا جادووشینەکە دەمامکەکەی لە دەموچاوی لابرد، ڕۆمیۆ زەردەخەنەیەک گرتی و گوتی:{دانکی ئەوە تۆی؟ زۆر سوپاس بۆ خوا کە تۆ زیندووی}

دانکی و ڕۆمیۆ بەسەرهاتی خۆیان بۆ یەکتر گێڕایەوە و ئینجا ڕۆمیۆ پێی گوت:{ماڵی بەڕێز ڕۆسی منیان بە دز داناوە و دەیانەوێ بمدەنە دەستی پۆلیس بەڵام من دز نیم} دانکی گوتی:{تاکە ڕێگا بۆ تۆ هەڵاتنە، بیر لەمە بکەرەوە بەیانی دێمەوە لات} ڕۆمیۆ ئەو شەوە زۆر غەمبار بوو پاشان بڕیاری دا کە هەڵبێت، هەر ئەو شەوە کاتێ بەڕێز ڕۆسی لە ژوورەکەی ئەنجیلیتا بوو بینی ئەنجیلیتا زۆر دڵتەنگە گوتی:{ئەنجیلیتا! کچەکەم بۆچی دڵتەنگی؟} لەو کاتەدا خاتوو ئیدا لە پشت دەرگاکە ڕاوەستا بوو و گوێی گرتبوو ئەنجیلیتا گوتی:{باوکە گیان دەمەوێ بڵێم ڕۆمیۆ پارەکانی نەدزیوە، ڕۆمیۆ دزی ناکات و دز نی یە} خاتوو ئیدا دەرگاکەی کردەوە و بە تووڕەییەوە گوتی:{ئەی پارەکان چۆن چوونە ناو جانتاکەی ڕۆمیۆوە؟ ئەی خۆ من وام نەکردووە و دڵنیام ڕۆسیش وای نەکردووە و ئەنجلیۆ......}هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ئەنجیلیتا قسە بکە. ئەنجلیۆ ئەمەی کردووە؟} ئەنجیلیتا گوتی:{بەڵێ، بەس تکایە ئازاری ئەنجلیۆ مەدەن من نامەوێ کەس لەم ماڵەدا ئازار بچێژێ} خاتوو ئیدا دەستی کردە گریان و گوتی:{ئەنجیلیتا گیان بەڕاستی تۆ میهرەبانیت، من هەموو هەوڵم دەخەمە گەڕ بۆ هێنانەوەی ڕۆمیۆ، تەنها تۆ خەفەت مەخۆ کچەکەم دەی ئێستا بخەوە}، ئەنجیلیتا پێکەنی و فرمێسکی خۆشی لە چاوانی تک تک دەهاتنە خوارێ و گوتی:{زۆر سوپاس دایکە گیان زۆر زۆر سوپاست دەکەم} ئینجا بەڕێز ڕۆسی و ژنەکەی لە ژوورەکەی ئەنجیلیتا چوونە دەرەوە بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ئێستا دەچم بە پۆلیس دەڵێم کە ڕۆمیۆ بێ تاوانە} بەڵام ژنەکەی تووڕە بوو و گوتی:{دەتەوێ بە پۆلیس بڵێی کە کوڕەکەمان دزە؟ ئەمە سەر شۆڕیە بۆ ئێمە و من هەرگیز ڕێگە نادەم کە کوڕەکەم بکەوێتە زیندان} .

بەیانی دانکی هاتەوە بۆ لای ڕۆمیۆ، ڕۆمیۆ گوتی:{دانکی بڕیارم داوە هەڵبێم} دانکی گوتی:{زۆر چاکە من دەتخەمە ناو عەرەبانەیەکەوە کە بەرەو ڤینیسیا دەڕوات، دەی وەرە بە دوامدا با بڕۆین} ڕۆمیۆ و دانکی

پێکەوە ڕۆیشتن بەرەو لای ئەو عەرەبانەیەی کە بۆ ڤینیسیا دەڕۆیشت، لەو کاتەدا نیکیتا و پۆتینۆ بەو ڕێگایەدا دەڕۆیشتن لەناکاو نیکیتا ڕاوەستا و گوتی:{پۆتینۆ سەیری ئەو ژن و پیاوە بکە کە لەسەر ئەو عەرەبانەیەن! ئەوانە کاری خراپ دەکەن تەقەمەنی تەوقیتکراویان پێیە!!} پۆتینۆ سەیری ئەولای کرد و گوتی:{نیکیتا سەیرکە ئەوە ڕۆمیۆیە لەگەڵ ئەو منداڵەدا ڕادەکات بەرەو ئەو عەرەبانەیە!!} نیکیتا زۆر بە سەرسوڕمانەوە سەیریانی دەکرد، دانکی ڕۆمیۆی کردە ناو سەندوقێکی سەر عەرەبانەکە لەو کاتەی کە خاوەنی عەرەبانەکە لەوێ نەبوو ئینجا خاوەنی عەرەبانەکە گەڕایەوە و سواری عەرەبانەکە بوو ڕۆیشتن،بەڵام ئەو عەرەبانەیەی ڕۆمیۆی تێدا بوو بەرەو ڤینیسیا نەدەڕۆیشت، ڕۆمیۆ و دانکی بەمەیان نەدەزانی، لەوکاتەدا نیکیتا بە ڕاکردن ڕۆیشت بۆ لای دانکی و گوتی:{تۆ بۆ وات کرد؟ تۆ دەتزانی ئەو عەرەبانەیە بۆ کوێ دەڕوات؟ ئەو عەرەبانەیە پڕی بوو لە بۆمبی دانراوە!!} دانکی ترسێکی زۆر دایگرت و گوتی:{ تۆ بەڕاستتە؟ ... وەرە بەدوامدا با بڕۆین ڕۆمیۆ ڕزگار بکەین} بەڵام نیکیتا گوتی:{من؟!}، دانکی گوتی:{بەڵێ! دەی وەرە ئەی تۆ هاوڕێی ڕۆمیۆ نیت؟}نیکیتا بە دوای دانکیدا ڕایکرد، کاتێک عەرەبانەکەی کە ڕۆمیۆی تیا بوو گەیشتە جێ ڕۆمیۆ سەری سەندوقەکەی هەڵدایەوە تاکو بزانێت لە کوێیە، بینی لە پێش بنکەی پۆلیس ڕاوەستاون، ڕۆمیۆ زۆر ترسا ژن و پیاوەکە سەندوقەکانیان بردە ناو بنکەی پۆلیس، هەر لەو کاتەشدا بەڕێز ڕۆسی لە بنکەی پۆلیس دانیشتبوو و سەبارەت بە دزییەکەی ڕۆمیۆ قسەیان دەکرد کاتێک ژن و پیاوەکە خەریکی دانانی سندوقە پڕ لە مۆمبەکان بوون دیکۆرۆ دەستی کردە دەنگە دەنگ ژنەکە سەری سەندوقەکەی هەڵدایەوە، کاتێک ژنەکە ڕۆمیۆی بینی فڕێیدایە ناو زیندانەکەوە و هاوڕێکەی خۆیان کە تاوانبار بوو و لەوێ زیندانی کرا بوو کردیانە ناو سەندوقێکەوە و بردیانە دەرەوە،ڕۆمیۆ بینی ئەوان تەقەمەنییەکانیان لەوێ داناوە زۆر ترسا هەر چەندە لە دەرگاکەی دەدا کەس گوێی لێ نەبوو، لەو کاتەدا دیکۆرۆ چووە بەرزاییەک و ڕاوەستا ڕۆمیۆ سەیری بەرزاییەکەی کرد

بینی پەنجەرەیەکی لێبوو خێرا لە پەنجەرەکەوە ڕایکردە دەرەوە، ڕۆمیۆ سەرەتا ویستی هەڵبێت بەڵام دواتر پەشیمان بووەوە و گەڕایەوە ناو بنکەی پۆلیس و پێی گوتن (: تکاتان لێ دەکەم لێرە بڕۆنە دەرەوە لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە تەقەمەنی لێرە دانراوە و پاش کەمێکی تر دەتەقنەوە، دەی تکاتان لێ دەکەم بڕۆن دەی!} کاتێ ڕۆیشت بۆ ژوورەکە بینی بەڕیز ڕۆسی لەوێیە پێی گوت:{دەی ماموستا گیان تکات لێ دەکەم بڕۆ دەرەوە لێرە ئێستا ئێرە دەتەقێتەوە!!} بەڵام پۆلیسەکە گوتی:{ ڕۆمیۆ تۆ گیراویت با بتبەم بۆ زیندان ئێمە گوێ بۆ ئەم چیرۆکە منداڵانەیە ناگرین} یەکسەر تەقەمەنیەکان تەقینەوە لەو کاتەدا دانکی و نیکیتا گەیشتنە لای عەرەبانەی تاوانبارەکان و دانکی گوتی:{ئەی تاوانبارینە کوانێ ڕۆمیۆ؟} ئەوانیش هیچ قسەیان نەکرد، دانکی بە پۆلیسەکانی گوت:{ چاوەڕێی چی دەکەن ئەمانە بوون بنکەی پۆلیسیان تەقاندەوە ئەگەر باوەڕ ناکەی فەرموو سەیری سەندوقەکەی دواوە بکە بزانە چی تێدایە!} پۆلیسەکە سەیری سەندوقەکەی کرد و بینی ئەو تاوانبارەی تێدایە کە خۆیان دەستگیریان کردبوو بۆیە ڕاستەوخۆ ژنەکە و پیاوەکە و تاوانبارەکەیان دەستگیر کرد، پاش کەمێک بەڕێز ڕۆسی هاتەوە هۆش خۆی بە دوای ڕۆمیۆدا دەگەڕا، کاتێک کە ڕۆمیۆی بینی هەڵیگرتەوە و لەسەر تەختەیەک داینا چونکە لە هۆش چووبوو پاشان پزیشکی بانگ کرد، لەبەر خۆیەوە دەیگوت :{ڕۆمیۆ گیان من زۆر سوپاست دەکەم تۆ ژیانی ئێمەت ڕزگار کرد تکایە هەستەوە..}



لەو کاتەدا ڕۆمیۆ هاتەوە هۆش خۆی و گوتی:{ماموستا گیان تۆ باشی؟ ئەی پۆلیسەکانی تر باشن؟} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ڕۆمیۆ گیان من زۆر باشم پۆلیسەکانیش بە گشتی باشن، ئەی تۆ؟ برینەکەت چۆنە؟} ڕۆمیۆ

گوتی:{من زۆر باشم، ئێستا دەتوانم بچمە سەر بەرزترین دوکەڵکێشی ئەم شارە} بەڕێز ڕۆسی فرمێسکی خۆشی بە چاوانی دا هاتە خوارەوە و ئینجا ڕووی کردە پۆلیسەکان و گوتی:{ڕاستیەک هەیە دەمەوێ پێتانی بڵێم}،پێیانی گوت کە ئەنجلیۆی کوڕی ئەو دزییەی کردووە. دواتر کاتێک ڕۆمیۆ و بەڕێز ڕۆسی چوونە دەرەوە بینیان خاتوو ئیدا و ئەنجلیۆ لەوێ دانیشتوون پۆلیسەکە گوتی:{ڕۆمیۆ دەڵێت من دزییم نەکردووە من بەش بەحاڵی خۆم باوەڕی پێ دەکەم} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{هەروەها منیش باوەڕی پێدەکەم و هەموو ڕاستیەکانیشم پێیان گوتوە} خاتوو ئیدا گوتی:{نەخێر ئەمە ڕاست نییە ڕۆمیۆ تاوانبارە، ئەگەر ئەو نەبێت ئەی کێ بووە؟}پۆلیسەکە گوتی:{ئەنجلیۆی کوڕت بووە} ئەنجلیۆش گوتی:{من!. نا ..نا ئەمە ڕاست نییە من نەبوومە ڕۆمیۆ بووە} دایکیشی دەستی کردە گریان و پەشیمان بوەوە و گوتی:{ نا. ئەنجلیۆ گیان تۆ بوویت،، ئەنجێلیتا بە چاوی خۆی تۆی بینی کە پارەکەت کردە ناو جانتاکەی ڕۆمیۆ} بەڕێز ڕۆسی بە تووڕەییەوە ئەنجلیۆی ڕاکێشاو گوتی:{دەی ئەنجلیۆ داوای لێبووردن لە رۆمیۆ بکە دەی} کە ئەنجلیۆ چووە پێش ڕۆمیۆ، ڕۆمیۆ سینگی ئەنجلیۆی گرت و گوتی:{تۆ چۆن ئەم هەموو درۆیەت بەسەر مندا کرد؟ ئێستا بزانم شەرم ناکەی لە خۆت؟ پێم بڵێ؟} پۆلیسەکە گوتی:{بەڕێز ڕۆسی ئەتوانی شایەتی بدەی لەسەر ئەم دزییەی کوڕەکەت؟} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{من بەرپرسیاریەتی هەڵدەگرم و هەر خۆشم چارەسەری ئەم کێشەیە دەکەم}.

ئینجا پۆلیسەکان داوای لێبوردنیان لە ڕۆمیۆ کرد و ئازادیان کرد، بەڕێز ڕۆسی و ڕۆمیۆ هاتنە دەرەوە لە بنکەی پۆلیس بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ڕۆمیۆ! ئەگەر پێت خۆشە لەگەڵ ئێمە بمێنیتەوە ئەوا دەتوانیت ئەگەر نا برۆ بۆ خۆت ئازادیت} ڕۆمیۆ گوتی:{توخوا؟} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{بەڵێ! هەر کاتێک ویستت دەتوانی سەردانمان بکەی، دەتوانی سەردانی ئەنجێلیتای کچم بکەی!تۆ هاوڕێی خێزانەکەمانی و دڵخۆش دەبین هەر کاتێک بێیت} ڕۆمیۆ بە سەرسوڕمانەوە گوتی:{من!؟ من...

ئازادم...؟} پێکەنی و گوتی:{زۆر سوپاست دەکەم مامۆستا گیان} ئینجا ڕایکرد و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:{من ئازادم کەواتە دەتوانم ئەنجێلیتا ببینم، ئەنجێلیتا وا هاتم} بەرەو ماڵی ئەنجێلیتا ڕایکرد کە گەیشتە لای ئەنجێلیتا، ڕۆمیۆ هاواری کرد:{ئەنجێلیتا} ئەنجێلیتا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی:{ڕۆمیۆ}، پاشان هەردووکیان سەیری یەکتریان دەکرد و پڕ بە دەنگی خۆیان پێکەنین و زۆر دڵخۆش بوون.
هەر ئەو ڕۆژە ڕۆمیۆ کارکردنی لەگەڵ بەڕێز ڕۆسی هەڵبژارد و بەڕێز ڕۆسیش دەستی کرد بە لابردنی دەرگا ئاسنینەکەی ژوورەکەی ڕۆمیۆ و دروستکردنی سیسەمێکی گەورە بۆ ڕۆمیۆ، ئەمەش هەر لەبەر ئەوە بوو تا پاداشتی ڕۆمیۆ بداتەوە، بەڕێز ڕۆسی هەفتەی ڕۆژێک پشووی دایە ڕۆمیۆ و ئەویش بڕیاری دا لەو ڕۆژە بەدوای ئەلفریدۆدا بگەڕێت.
بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆمیۆ ڕۆیشت بە دوای ئەلفریدۆدا بگەڕێت گەیشتە کۆڵانێک لە پیاوێکی پرسی:{ببورە گەورەم! ئێرە کۆڵانی هۆڵی کۆبوونەوەی گشتییە؟} پیاوەکە گوتی:{بەڵێ} ڕۆمیۆ گوتی:{کوڕێک دەناسی لە دوکەڵکێش پاککردنەوە کار دەکات؟ ئەو باڵای کەمێک لە من بەرزترە و ناوی ئەلفریدۆیە} پیاوەکەش گوتی:{نا. نایناسم} و ڕۆیشت، لەولاوە منداڵێکی بچوک هات و چاکەتەکەی ڕۆمیۆی ڕاکێشا و گوتی:{من دەیناسم ..ئەو لەو شوێنەیە} منداڵەکە ئاماژەی بۆ ژوورێکی بچووک کرد لە کەلاوەیەک دەچوو ڕۆمیۆ سوپاسی منداڵەکەی کرد و ڕایکرد بەرەو ژوورەکە و بینی یەکێک لە سەر زەوییەکە خەوتبوو بەتانیەکی بەسەردا درا بوو، ڕۆمیۆ جولاندیەوە و گوتی:{ئەلفریدۆ هەستە ئەوە منم ڕۆمیۆ} بەڵام کاتێک لە ژێر بەتانیەکە هەستا کەسێکی تر بوو گوتی:{تۆ هاوڕێی ئەلفریدۆی؟} دواتر منداڵێکی تریش هەستایەوە و گوتی :{ئایا تۆ هاوڕێی ئەلفریدۆی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵێ، ئێوە ئەلفریدۆ دەناسن؟} یەکێکیان گوتی:{بەڵێ دوێنێ ئێمە زۆر برسیمان بوو چەند لەفەیەکی گەورەی داینێ، بەڕاستی خۆش بوو} ڕۆمیۆ گوتی:{ئێستا ئێوە دەزانن ئەلفریدۆ لە کوێیە؟} منداڵێکیان گوتی:{بەداخەوە نەخێر بەڵام وابزانم

ئۆرتۆ شوێنەکەی دەزانێ} شوێنی ئۆرتۆ یان بە ڕۆمیۆ گوت، ڕۆمیۆ زۆر بە خێرایی خۆی گەیاندە لای ئۆرتۆ و گوتی:{ئۆرتۆ پێم بڵێ تۆ چۆن ئەلفریدۆت ناسی؟} ئۆرتۆ گوتی:{کاتێ دەستەی گورگەکان ڕێگەیان لە من گرتبوو ئەلفریدۆ هات و ڕزگاری کردم ئەو کاتە ناسیم} ڕۆمیۆ گوتی:{ئایا ئێستا دەزانی ئەلفریدۆ لە کوێیە؟} ئۆرتۆ گوتی:{بە داخەوە نازانم، منیش حەز دەکەم جارێکی تر بیبینمەوە و سوپاسی بکەم}، ئیتر ڕۆمیۆ بە خەمبارییەوە بە ڕێگادا دەڕۆیشت لە ناکاو بینی دەستەی گورگەکان ڕێگەیان بە منداڵێک گرتووە ئەویش بیری کردەوە کە پێویستە یارمەتی ئەو منداڵە بدات بەردێکی هەڵدا بۆیان تاسیۆنی و ڕیۆ ئاوڕیان دایەوە ئینجا بە دوایی ڕۆمیۆ کەوتن هەتاکو ڕۆمیۆ خۆی هەڵدایە سەر عارەبانەیەک و خۆی شاردەوە، کاتێ تاسیۆنی و ڕیۆ گەیشتنە سەر شەقامەکە نەیانزانی ڕۆمیۆ بەرەو کوێ ڕایکرد بۆیە ڕۆمیۆیان لێ بزر بوو.

ڕۆمیۆ کاتێ بینی تاسیۆنی و ڕیۆ ڕۆیشتن خۆی هەڵدایە سەر زەویەکە و لەبەرخۆیەوە گوتی:{سەرکەوتم!}.

ڕۆمیۆ گوێی لە ژنێک بوو بە منداڵەکەی دەگوت:{کوڕی خۆم ئەوەی بەرامبەرمان هۆڵی کۆبوونەوەی گشتییە} ڕۆمیۆ گوتی:{هۆڵی کۆبوونەوەی گشتی؟} ڕۆیشتە ناو هۆڵەکەوە بینی یەکێک لەوێ دانیشتووە و سەرقاڵی خوێندنەوەیە، کاتێ چووە پێشەوە بینی ئەلفریدۆیە گوتی:{ئەلفریدۆ!} ئەلفریدۆ کە گوێی لە دەنگی ڕۆمیۆ بوو کتێبەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە ئاوڕی دایەوە گوتی:{ڕۆمیۆ!} ئینجا ڕۆمیۆ بەرەو لای ئەلفریدۆ ڕایکرد ئەلفریدۆ گوتی:{ڕۆمیۆ گیان با هەر لەسەر پەیمانەکەی خۆمان بمێنینەوە} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە ئەلفریدۆ گیان پەیمانت دەدەمێ} ئینجا دانیشتن بەسەرهاتی خۆیان بۆ یەکتری باس کرد و بڕیاریاندا کە کۆبوونەوەیەک بکەن بۆ هەموو دوکەڵکێش پاککەرەوەکان دواتر ڕۆمیۆ هەموویانی ئاگادار کردەوە.

ڕۆژی کۆبوونەوەکە هەموو دوکەڵکێش پاککەرەوەکان لە شوێنی مەبەست

ئامادە بوون ئەلفرێدۆ بردیانی بۆ شوێنێک کە ژوورێکی گەورە بوو و پێیانی گوت ئەم ژوورە دەبێتە بنکەی تایبەتییمان، هەموو منداڵەکان لەسەر ئەوە ڕازی بوون و بڕیاریاندا ئەلفرێدۆ بکەنە سەرۆکیان، ئەلفرێدۆ گوتی:{من زۆر سوپاستان دەکەم، کەواتە با ناوی دەستەکەمان بنێین دەستەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان، دەی با ئێستا ئاهەنگ بگێڕین بەهۆی دامەزراندنی دەستەکەمانەوە و با ئەم مۆمانە دابگیرسێنین} منداڵەکان هەموویان دڵخۆش بوون و یارمەتی یەکتریان دەدا لە داگیرساندنی مۆمەکان ئینجا هەمویان دەیانگوت:{پەیمان دەدەین لەسەر پشتگیری کردنی یەکتری، پەیمان دەدەین یارمەتی یەکتری بدەین لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان، پەیمان دەدەین کە یەکگرتوو بین و دڵسۆز بین بۆ یەکتری،و ....هتد} ئەو شەوەیان زۆر بە خۆشی بەسەر برد.

ڕۆژی دواتر ڕۆمیۆ کوورەی ماڵێکی خاوێن دەکردەوە، کاتێک لە کوورەکە هاتە دەرەوە بینی میشۆکی هاوڕێی بە هێما پێی دەڵێ کە ئەم شەو کۆبوونەوەمان هەیە ڕۆمیۆ بە هێما پێی گوت کە تێگەیشتووە، کاتێ شەو داهات هەموو لە بنکەی تایبەتی ئامادە بوون و باسی ئەوەیان کرد کە دەبێ ڕووبەڕووی دەستەی گورگەکان ببنەوە ڕۆمیۆ گوتی:{باشە من دەچم ڕووبەڕوویان دەبمەوە} بەڵام ئۆرتۆ گوتی:{نەخێر من دەچم ڕووبەڕوویان دەبمەوە چونکە لە هەمووتان ئازاترم} ڕۆمیۆ گوتی:{نەخێر من ئازاترم} پاشان بینیان ئەلفرێدۆ لە لای دەرگاکە ڕاوەستاوە ڕۆمیۆ گوتی:{ئەلفرێدۆ ئەی تۆش پێت باش نییە من بچم ڕووبەڕووی دەستەی گورگەکان ببمەوە؟} ئەلفرێدۆ



گوتی:{نا ڕۆمیۆ گیان دەستەی گورگەکان منداڵی هار و دڕندەن پێویستە چارەسەرێک بۆ ئەم کێشەیە دابنێین} ڕۆمیۆ بە تووڕەییەوە لە دووری ئەوان دانیشت ئەلفریدۆ ئەو نەخشەیەی دایناپوو بۆ منداڵەکانی ڕوون کردەوە و ئینجا ئامێرێکی بچووکی دایە میشۆک کە دەنگێکی گەورەی هەبوو بۆ ئەوەی کاتێ دەستەی گورگەکان هێرشیان بردە سەر میشۆک بەو ئامێرە بچووکە ئاگاداریان بکاتەوە، دواتر زۆر شتی تری بە منداڵەکان گوت.

پاشان هەموو منداڵەکان دەستیان کردە مللی یەکتر و بەرەو ماڵی خۆیان گەڕانەوە لەناکاو دانکی گوتی:{ڕۆمیۆ دەزانی جانتاکەت بەجێ هێشتووە؟} ڕۆمیۆ گوتی:{ئۆو!وەڵا ڕاستدەکەی} ئینجا گەڕایەوە و بینی ئەلفریدۆ دەخوێنێتەوە ئەویش بەبێ دەنگی جانتاکەی هەڵگرت ویستی بڕوات بەڵام ئەلفریدۆ هەستی کرد کە یەکێک هاتۆتە ژوورەوە ئاوڕی دایەوە و گوتی:{ڕۆمیۆ زۆر بەبێ دەنگی هاتیتە ژوورەوە!} ڕۆمیۆ سەیری ئەلفریدۆی کرد و گوتی:{ئەلفریدۆ من داوای لێبوردن دەکەم لەسەر ئەو ڕەفتارەی ئەمڕۆ نواندم} ئەلفریدۆ گوتی:{ڕۆمیۆ من هەر بیریشم لێ نەکردبۆوە} ئەو کتێبەی بەدەستیەوە بوو لاپەڕەکانی خەریک بوو بکەوێتە خوارەوە بەڵام ئەلفریدۆ گرتییەوە ڕۆمیۆ پرسی:{بۆچی لاپەڕەکانی لێبوونەتەوە؟}ئەلفریدۆ گوتی:{ئاخر ئەم کتێبەی من زۆر کۆنە} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە وەرە لەگەڵم من بە دکتۆر کاستێلات دەناسێنم، ئەو خاوەنی کتێبخانەیەکی زۆر گەورەیە}بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ ماڵی دکتۆر کاستێلا، ڕۆمیۆ بەیەکتریانی ناساند دکتۆر کاستێلا گوتی:{ئەلفریدۆ پێخۆشحاڵم بە ناسینت، وەرە با بچینە کتێبخانەکەم و هەر کتێبێکت ویست بیبە بیخوێنەوە و پاشان وەرەوە کتێبێکی تر ببە} ئەلفریدۆ سوپاسی کرد و کتێبێکی هەڵگرت کە تێگەیشتن لەو کتێبە زۆر ئەستەم بوو، خزمەت کاری دکتۆر کاستێلا لە ڕۆمیۆی پرسی:{ئەلفریدۆ چەند ساڵ لە تۆ گەورەترە؟} ڕۆمیۆ گوتی:{یەک ساڵ!! } خزمەتکارەکە گوتی:{ زۆر گەورەتر دیارە و حەز بە خوێندنەوەی کتێبی گران دەکات!!، بەڵام ڕۆمیۆ تۆ هێشتا

منالێکی بچووکی} ڕۆمیۆ بە دڵتەنگیەوە گوتی:{من بچووکم؟} پاشان دکتۆر کاستێلا و ڕۆمیۆ و ئەلفرێدۆ خوداحافیزییان لە یەکتر کرد، ڕۆمیۆ ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە لەبەر خۆیەوە دەیگوت:{من بچووکم؟ کەواتە هەتاکو فێری خوێندنەوە و نوسین نەبم گەورەش نابم!!} پاشان ئەو کتێبەی بیر کەوتەوە کە ئەنجێلیتا پێی دابوو و بڕیاریدا بیخوێنێتەوە.

بۆ بەیانی کاتێک ئەلفرێدۆ سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەو کتێبە بوو کە لە لای دکتۆر کاستێلا هینابووی لە ناکاو وەستاکەی هاتە لای و گوتی:{ئەمە چییە؟ دیسان بەزمەکەیە؟ لەئەمڕۆ بەدواوە نامەوێ هیچ کتێبێک لە دەستت ببینم، یەڵلا هەستە کار بکە} کتێبەکەی لە دەستی فڕێدایە خوارەوە، بۆ ئێوارە ڕۆمیۆ لەلای ئەنجێلیتا دانیشتبوو یەکسەر هەستا و گوتی:{ئەنجێلیتا من دەمەوێ بڕۆم} ئەنجێلیتا گوتی:{ئەوە چیە ڕۆمیۆ؟! تۆ ئەم ماوەیە زۆر لە ژوورەکەت دادەنیشیت و کەمیش قسە لەگەڵ من دەکەیت؟} ڕۆمیۆ گوتی:{ئەنجێلیتا من هەندێ کاری تایبەتیم هەیە} ئینجا ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی و دەستی کردبە خوێندنەوەی کتێبەکە.

ئەلفرێدۆ بە شەو و بە ڕۆژ کتێبەکەی دەیخوێندەوە هەتاکو تەواوی کرد، ئیجا بردییەوە بۆ دکتۆر کاستێلا و پێی گوت:{دکتۆر کاستێلا من زۆر داوای لێبوردن دەکەم لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە دوو لاپەڕەی لێ دڕاوە ئەوانەی لە بیرم مابوو لەسەر ئەم دوو لاپەڕەیە نووسیمەوە، من زۆر داوای لێبوردن دەکەم} پاشان ڕۆیشت، دکتۆر کاستێلا کتێبێکی تری لە هەمان ئەو کتێبە هەبوو کە دابووی بۆ ئەلفریدۆ بۆ خوێندنەوە، ڕۆیشت هێنای و تەماشای کرد ئەو وشانەی ئەلفرێدۆ نووسیوێتی هەمان ئەو وشانەی ناو کتێبەکەیە، دکتۆر کاستێلا زۆر بە سەر سوڕمانەوە سەیری وشەکانی دەکرد پاشان لەبەر خۆیەوە گوتی:{ئەم کوڕە لە هاوتەمەنەکانی خۆی ناچێت زۆر جیاوازە شتێکی تایبەتی لە کەسایەتییدا هەیە کە وای لێدەکات هەمیشە بیر بکاتەوە!!، لە ئاییندەدا یەکێک دەبێت لەو کەسانەی مێژوو ناویان تۆمار دەکات و هەرگیز لە بیر ناکرێن!!}.

بۆ بەیانی ڕۆمیۆ لە خەو هەستا کتێبەکەی تەواو کرد و بردییەوە بۆ

ئەنجێلیتا، بەڵام ئەنجێلیتا خەوتبوو، بۆیە بەبێ دەنگی کتێبەکەی بۆ دانایەوە و ڕۆیشت، ئەو ڕۆژە ئەلفریێدۆ و ڕۆمیۆ و هاوڕێکانی تریان نەخشەی ئەوەیان دانابوو کە بگەن بە دەستەی گورگەکان و شەڕیان لەگەڵدا بکەن، ئەوە بوو بە میشۆکیان ڕاگەیاند کە دەبێ لە لای نانەوا خانەکە ڕاوەستێت، خۆشیان لە نزیکەوە چاودێرییان دەکرد.



دەستەی گورگەکان هەموویان لە شوێنە تایبەتییەکەی خۆیان بوون، پاش کەمێک جیۆڤانی بەجێی هێشتن و چوو بۆ لای دەستەی دوپشکەکان لەبەر ئەوەی سەرۆکی دەستەی دوپشکەکان بە جیۆڤانی گوتبوو کە بچێت بۆلایان بۆ کاری تایبەت، تاسیۆنی و لیۆناردۆ و ئەوانی تریش بڕیاریاندا بچن ڕێگە لە میشۆک بگرن چونکە دەیانزانی میشۆک لە لای نانەوا خانەکە کار دەکات، کاتێک ڕیۆ گەیشتە لای نانەوا خانەکە بینی میشۆک لەوێ ڕاوەستاوە، کاتێ میشۆک ڕیۆی بینی ڕایکرد بەرەو ئەو شوێنەی کە ئەلفریێدۆ پێی گوتبوو و ڕیۆش بەدواییدا ڕای کرد تا گەیشتنە شوێنەکە ڕیۆ گوتی:{ئیتر ڕێگات لێگیرا میشۆک } بەڵام کە ئاوڕی دایەوە بینی هەموو دوکەڵکێش پاککەرەوەکان دەوریان داوە، ڕیۆ بە ترسەوە گوتی:{چیتان دەوێ؟} ڕۆمیۆ گوتی:{دەمانەوێ ئاقڵت بکەین، ئێمە وەک ئێوە ترسنۆک نین لە تەنها منداڵێک بدەین! ئێمە وەک ئێوە شەڕاوی نین!} ئەلفریێدۆ گوتی:{ئێمە بەرەنگاری هەمووتان دەبینەوە ئەمڕۆ کاتژمێر پێنج لە نزیک کۆشکە کۆنەکە چاوەڕێتان دەکەین دەستەکەتان ئاگادار بکەرەوە} ئیتر هەموویان ڕۆیشتن و ڕیۆیان بەجێهێشت،ڕیۆ ڕایکرد بەرەو شوێنە تایبەتییەکەی خۆیان و بە دەستەی گورگەکانی ڕاگەیاند کە دەبێ شەڕ بکەن، تاسیۆنی ئەمەی زۆر پێخۆش بوو!!

ئێوارە دەستەی گورگەکان بەبێ جیۆڤانی بەڕێکەوتن بەرەو لای کۆشکە کۆنەکە،لەوێ دوکەڵکێش پاککەرەوەکان ئامادە بوون بە چەند پیلانێک کە ئەلفریێدۆ دایانبوو سەرکەوتنیان بە دەست هێنا ئەلفریێدۆ گوتی:{ئێمە نامانەوێ هەرگیز شەڕ بکەین، بەڵام ناچارمان دەکەن} پاشان ڕووی کردە نیکیتا و گوتی:{ هەرگیز ڕێگا بە کوڕ نادەم لە کچ بدات} ئینجا ڕۆیشتنەوە بۆ بنکە تایبەتییەکەی خۆیان زۆر دڵخۆش بوون لەبەر ئەوەی بەسەر دەستەی گورگەکاندا سەرکەوتبوون پاشان ئەلفریێدۆ گوتی:{گوێ بگرن هیچ کەس لە ئێوە نابێ بە تەنها بچێتە دەرەوە لەبەر ئەوەی دەستەی گورگەکان متمانەیان پێ ناکرێت و ڕەنگە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە} لەگەڵ ڕۆمیۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لە ڕێگا کە ڕۆمیۆ ڕۆیشت نیکیتا بانگی ئەلفریێدۆی کرد و گوتی:{ئەلفریێدۆ ئەمڕۆ کە تۆ سەیری ناو چاوانمت دەکرد زانیم کە شتێک هەیە و دەتەوێ پێمی بڵێیت، ئێستا پێمبڵێ دەتویست چی بڵێی ؟} ئەلفریێدۆ گوتی:{من کاتێ سەیری چاوەکانت دەکەم کچێکم بە بیر دێتەوە کە زۆر لە تۆ دەچێت، نیکیتا تۆ بۆچی دەتەوێ وەکو کوڕێک هەڵسوکەوت بکەی؟ تۆ ئەگەر ئێستا گوڵێک لە پرچت بدەی زۆر جوانتر دەبیت هەروەکو گوڵ..!} نیکیتا تووڕە بوو ڕایکرد و بەجێهێشت، جیۆڤانی کە لە لای دەستەی دوپشکەکان بوو خەریکی شەڕکردن بوو چونکە دەستەی دووپشکەکان فێڵیان لێکردبوو بۆ شەڕ بانگیان کردبوو، بەڵام کاتێک سەرکەوتنی بە دەست هێنا دەستەی دوپشکەکان داوایان لە جیۆڤانی کرد وەریان بگرێت لە دەستەی گورگەکان .

کاتێک جیۆڤانی گەڕایەوە بۆ شوێنە تایبەتییەکەیان زۆر تووڕە بوو لەبەر ئەوەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو بەسەر گورگەکاندا هەر لەوێ بڕیاری ئەوەیان دا تۆڵەیان لێ بکەنەوە نیکیتا گوتی پیلانێکی باشم هەیە، دواتر بۆی باسکردن.

بۆ ڕۆژی دواتر دانکی و میشۆک و ئەنتۆنیۆ پێکەوە بوون بەدڵخۆشیەوە باسی سەرکەوتنەکەی ڕۆژی ڕابردوویان دەکرد، لەناکاو یەکێک گوتی:{سڵاو!} میشۆک گوتی:{ئەوە ڕیۆیە! ها ڕیۆ چیت دەوێ؟} ڕیۆ

گوتی:{من هاتوم داوای لێبوردنتان لێ بکەم، من کێشەی زۆرم بۆتان ناوەتەوە، تکایە باوەڕم پێ بکەن!؟} منداڵەکان هەندێک ڕامان !! دواتر دانکی گوتی:{باشە} پاشان ڕیۆ گوتی:{من سەبەتەیەک سێوتان بۆ دەهێنم وەک دیارییەک بۆ هاوڕێیەتیمان} میشۆک گوتی:{باشە من دێم لێتی وەردەگرم} ڕۆیشتن،لە ناکاو ڕۆمیۆ هات و گوتی:{سڵاو هاوڕێیان ئەرێ ئێستا گوێم لە دەنگی ڕیۆ بوو،نەتان بینیوە؟} دانکی گوتی:{با..ئێستا لێرە بوو و پەیمانی هاوڕێیەتی پێداین و میشۆکیشی لەگەڵ خۆی برد} ڕۆمیۆ بە شڵەژاوی گوتی:{میشۆک بە تەنها ڕۆیشت؟ بۆچی ڕۆیشت؟} ئەنتۆنیۆ گوتی:{بەڵێ بە تەنها ڕۆیشت بۆ ئەوەی میوە لەگەڵ ڕیۆ بهێنێت} ڕۆمیۆ گوتی:{میوە !! بۆچی؟}دانکی گوتی:{دیاری هاوڕێیەتی}.
کاتێ میشۆک لەگەڵ ڕیۆ ڕۆیشت بینی هەموو دەستەی گورگەکان لەوێن ئینجا میشۆکیان برد و چاکەتەکەیان پێ دانا و نیکیتا نامەیەکی نوسی و خستیە گیرفانی چاکەتەکەی میشۆک، کاتێ ڕۆمیۆ بەدوای میشۆکدا دەگەڕا چاکەتەکەی دۆزییەوە و نامەکەی خوێندەوە کە نیکیتا نوسیبووی بینی نوسراوە{میشۆک لە ژێر دەستی ئێمە دایە ئەگەر دەتانەوێ بیبەنەوە ئەوا ئەلفریدۆمان بە تەنها بۆ بنێرن} ڕۆمیۆ ڕۆیشتە لای ئەلفریدۆ و بە خەمبارییەوە بە ئەلفریدۆی گوت کە دەستەی گورگەکان داوایان کردووە بە تەنها بچێت، ئەلفریدۆ خێرا ڕۆیشت بۆئەوەی میشۆکی هاوڕێیان ڕزگار



بکات و ڕۆمیۆش لەگەڵیدا ڕۆیشت، کاتێک ئەلفریدۆ گەیشتە لای دەستەی گورگەکان داوای کرد میشۆک ئازاد بکەن ئەوانیش میشۆک یان ئازاد کرد بەڵام ئەلفریدۆیان دەستگیر کرد، کە ڕۆمیۆیان بینی هەڕەشەیان لێکرد ئەگەر نزیک بێتەوە ئازاری ئەلفریدۆ دەدەن، بۆیە ڕۆمیۆ لەشوێنی خۆی وەستا، پاشان دەستەی گورگەکان بە ڕۆمیۆیان گوت دەبێت بۆ ڕۆژی دواتر هەموویان بێن بۆ ئەوەی شەڕ بکەن،

ڕۆمیۆ گەڕایەوە بۆ بنکە تایبەتییەکەیان و بەسەرهاتەکەی بۆ هاوڕێکانی باسکرد پێی گوتن:{ئێمە دەبێ بڕۆین ئەلفرێدۆ ڕزگار بکەین} بەڵام هەندێک لە منداڵەکان ترسان و پەشیمان بوونەوە گوتیان ئێمە نایەین، ڕۆمیۆ گوتی:{هاوڕێیان ئەی ئێوە پەیمانتان نەدا لە هەموو خۆشی و ناخۆشیەک بەشداری لەگەڵ یەکتردا بکەن؟. باشە من بە تەنها دەڕۆم ئەگەر تا بەیانی بڕیاری خۆتان گۆڕی وەرن لەگەڵم} پاشان گەڕایەوە بۆماڵەوە، ڕۆمیۆ ئەو شەوە خەوی لێ نەدەکەوت هەر بیری لە بەیانی دەکردەوە.

لەناکاو بینی ئەنجێلیتا لە لای دەرگای ژوورەکەی ڕۆمیۆ ڕاوەستاوە ڕۆمیۆ فەرمووی لێ کرد ئەنجێلیتا چووە ژوورەوە و ملوانکەیەکی کردە ملی ڕۆمیۆ و داوای لێکرد کە بیپارێزێت، ئەو شەوە جیۆڤانی نیکیتای کردبووە پاسەوانی ئەلفرێدۆ نیکیتا لە ئەلفرێدۆی پرسی:{ئەگەر منداڵەکان نەهاتن تۆ چی دەکەی؟} ئەلفرێدۆ پێکەنی و گوتی:{من متمانەم بە ڕۆمیۆیە و دڵنیام کە ئەو دێت}.

بۆ بەیانی ڕۆمیۆ ڕۆیشت بەرەو لای دەستەی گورگەکان لە ڕێگا هەموو منداڵەکان دوای کەوتن تەنانەت دانکیێشیان لەگەڵ بوو، کاتێک گەیشتنە لای دەستەی گورگەکان جیۆڤانی پێیانی ڕاگەیاند کە بەبێ چەقۆ شەڕ دەکەن دوکەڵکێش پاککەرەوەکان ئەمەیان زۆر پێ باش بوو، بەڵام هەرچەندە شەڕیان کرد بێ سوود بوو کەسیان نەیانتوانی بەسەر ئەویتردا زاڵ بێت لەبەر ئەوەی ژمارەیان یەکسان بوو ئیتر جیۆڤانی بڕیاری دا کە تەنها تاسیۆنی و ڕۆمیۆ شەڕ بکەن دوای شەڕێکی درێژ

خایەن تاسیۆنی پەیمانەکەی شکاند و چەقۆی لە ڕۆمیۆ ڕاکێشاو ڕۆمیۆ کەوتە سەر زەوی، کاتێ تاسیۆنی بە چەقۆکەی دەیویست ڕۆمیۆ بکوژێ، هەتاوەکە دای لە چەقۆکە و و تیشکەکەی دای لەناوچاوی تاسیۆنی و ڕۆمیۆش ئەوەی بە هەڵ زانی و پاڵی بە تاسیۆنی یەوە ناو تاسیۆنی کەوتە سەر زەوییەکە، ئیتر ڕۆمیۆ سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئینجا دەستەی گورگەکان ئەلفرێدۆیان ئازاد کرد و دەستەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکانیش دەستیان کردە ملی یەکتر و بە ڕێگادا دەڕۆیشتن و دەیانگوت:-



ئـێمەی هــاوڕێــیان
هاوڕێی خۆشـەویـست
بۆ یەکتری ئێمە هەموومان
چاوی ئێمە پــڕ لە سۆزە
بۆ یارمەتی و هاوکاری یەکـتری
بە یەک دەنگ و توانا هەرهەموو
ئــێمەی هاوڕێــیان
هاوپــشت بــە وەفـا

هەمـوو وەک برایــن
بۆ یەک بووین بە ویست
خۆشی ئەخوازیین بۆ هەموو جیهان
دەمیشمان هەمیشە پڕ لە خەنـدە
خۆزگە و ئاواتمان بــۆ ئەوە ئەژین
هاوکار و هاوسـەنگین دوو بە دوو
هەمـوو وەک برایـن
ئـەژیـن وەک بــرا

ئینجا گەڕانەوە و ڕۆمیۆ زۆر دڵخۆش بوو.
بۆ بەیانی ڕۆمیۆ دوو گوڵی لە باخەکەیان لێکردەوە و بردی بۆ ئەنجێلیتا و باسی ژیانی خۆی بۆ کرد لە گوندەکەیان، ئەنجێلیتا زۆر دڵی خۆش بوو، پاشان ڕۆمیۆ لەگەڵ بەڕێز ڕۆسی چووە سەر ئیشەکەی بەڕێز ڕۆسی لە ڕێگا باسی ژیانی منداڵی خۆی بۆ ڕۆمیۆ دەکرد، لە ناکاو گالیسکەیەک لەلایەندا وەستاو خاوەنەکەی گوتی:{بەڕێز ڕۆسی نامەیەکت بۆ هاتووە فەرموو ائەوەتا } بەڕێز ڕۆسی نامەکەی لێوەرگرت و بە

ڕۆمیۆی گوت:{بیخوێنەوە بزانە ئەم نامەیە لەلایەن کێوە هاتووە؟} ڕۆمیۆ نامەکەی خوێندەوە نوسرابوو:{لەلایەن دایکت، ڕۆژی پێنج شەمە دێم بۆ سەردانت و خەزێنەی ماڵەکەش لەگەڵ خۆم دێنم و پێشکەشی ئەنجلیۆی دەکەم} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{چی؟ ئێ خۆ ئەمڕۆ پێنج شەمەیە!!} ئیتر هەردووکیان بە پەلە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، بەڕێز ڕۆسی بە خاتوو ئیدای گوت کەچی لە نامەکەدا نووسراوە بۆیە خاتوو ئیدا ئەنجلیۆی ئامادەکرد بۆ پێشوازی کردن لە داپیرەی چونکە دەیویست ئەو خەزێنەیەی باسی کردبوو بیدات بە ئەنجیلۆی کوڕی، کاتێک داپیرەی ئەنجلیۆ گەیشت ڕۆمیۆ لە ژوورەکەدا خەریکی پککردنەوەبوو .

داپیرە وایزانی ڕۆمیۆ ئەنجلیۆیە زۆر دڵی پێی خۆش بوو کە بینی خەریکی ئیشە، بەڵام دوایی بۆی دەرکەوت کە ڕۆمیۆ لەگەڵ بەڕێز ڕۆسی لە دوکەڵکێش پاککردنەوە کار دەکات و ئەو ئەنجلیۆ نییە، پاشان ئەنجلیۆ هات وبەخێرهاتنی داپیرەی کرد، داپیرەی لێی پرسی:{تۆش وەکو ڕۆمیۆ یارمەتی باوکت دەدەی لە دوکەڵکێش پاککردنەوە؟} ئەنجلیۆ پێکەنی و گوتی:{نەخێر!.... بەڵام بەتەمام یارمەتی بدەم} داپیرە بە ڕوویەکی گرژەوە گوتی:{ئەمە باشە. } پاشان گوتی:{ڕۆمیۆ کوڕی خۆم! دەتوانی دەستم بگریت هەتاکو ژوورەکەی ئەنجێلیتا بمبەی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە بەسەرچاو..} دەستی داپیرەی گرت و بردی بەرەو ژوورەکەی ئەنجێلیتا، داپیرە سەیری ئەنجلیۆی کرد گوتی:{ئەنجلیۆ تۆش کوپێک چام بۆ بهێنە} پاشان ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی ئەنجێلیتا و سڵاوی لێکرد و پێی گوت کە دیارییەکی بۆی هێناوە ئەو دیارییەش چەند گوڵێکی جوانی ڕەنگاو ڕەنگ بوون ئەنجێلیتا پڕ بە دڵی سوپاسی داپیرەی کرد و چەند جارێکیش دوبارەی کردەوە چونکە ئەنجێلیتا زۆر حەزی لە گوڵ بوو، پاشان داپیرە کڵاوەکەی سەری دانا و ڕووی کردە ئەنجلیۆ و گوتی:{ئەنجلیۆ کوڕی خۆم! ئەم کڵاوە خەزێنەی ماڵەکەمانە و پێشکەشی تۆی دەکەم} دایکی ئەنجلیۆ بە ناڕەحەتییەوە گوتی:{چی؟ ئەی ئەو بەردە گران بەهایانەی خەزێنەی ماڵەکەتان چی لێهات؟} داپیرە گوتی:{فرۆشتم،.. ( ڕووی لە

ئەنجیلۆ کرد) چییە ئەنجلیۆ دیارییەکەت بە دڵ نییە؟} ئەنجلیۆ بە بێ ڕێزییەوە گوتی:{نامەوێ ...بیدە بە ڕۆمیۆ} داپیرە گوتی:{زۆر چاکە. کەواتە ڕۆمیۆ ئەمە بۆ تۆیە} ڕۆمیۆ بە خۆشحاڵییەوە گوتی:{زۆر سوپاس داپیرە گیان}، پاشان بەڕێز ڕۆسی تووڕە بوو و گوتی:{تۆ هیچ مافێکت نییە بەبێ پرس خەزێنەی ماڵەکەمان بفرۆشیت} داپیرە گوتی:{ئەگەر نەم فرۆشتایە ئەوا تۆ نەدەبوویتە ئەو پیاوەی کە ئێستا دەنگت لەسەرم بەرز بکەیتەوە} بەڕێز ڕۆسی هێمن بووەوە و هەستی بە شەرمەزاری کرد، داپیرە بۆیانی باس کرد و گوتی:{کاتێ ڕۆسی منداڵ بوو نەخۆشیەکی لە ناکاوی توشبوو و منیش هیچ سەرمایەیەکم لەبەردەست نەبوو ناچار بەردەکانم فرۆشت بە پارەیەکی زۆر کەم لەبەر ئەوەی بەردەکان ساختە بوون، بە پارەکەی پزیشکم بۆ ڕۆسی هێنا و چارەسەرم بۆ کڕی تا چاک بووەوە، بەڵام ئەم کڵاوە کە بە دەستی خۆم بۆم چنی بوو هەرگیز داینەدەکەند زۆری خۆشدەویست و دەیگوت:دایە گیان من ئەم کڵاوە داناکەنم هەتاکو دەبمە دەریاوان و کڵاوی دەریاوانی لەسەر دەکەم!، بۆیە منیش ئەم کڵاوەم بە خەزێنەی ماڵەکەمان دانا} بەڕێز ڕۆسی زەردەخەنەیەک گرتی و گوتی:{بەڵام بەو ئاواتەم نەگەیشتم} دایکی گوتی:{دوکەڵکێش پاککردنەوەش کارێکی خراپ نییە} بەڕێز ڕۆسی فرمێسکی شەرمەزاری لە چاوانی هاتەخوارەوە و گوتی:{دایە گیان من زۆر داوای لێبوردنت لێ دەکەم تکایە بمبوورە}.

پاشان داپیرە داوای کرد ڕێگەی بدەن بگەڕێتەوە، ئەوانیش بە خۆشحاڵییەوە بەڕێیان کرد.

بۆ بەیانی ڕۆمیۆ لە دەنگە دەنگی ماڵی خاتوو مادێلای دراوسێیان بەخەبەر هات، ڕایکرد بۆ لای ئەنجێلیتا لێی پرسی :{ئەنجێلیتا ئەوە چی بووە لە ماڵی خاتوو مادێلا؟} بەڵام ئەنجێلیتاش هیچی نەدەزانی، پاشان هەردووکیان گوێیان لێبوو خاتوو مادێلا بە تووڕەییەوە بە پیاوەکەی دەگوت:{بۆچی بازنەکەمت فرۆشتووە؟ ها...! بۆ؟} پیاوەکەیش بە ترسەوە دەیگوت:{بەخوا من نەم فرۆشتووە باوەڕم پێ بکە!} ئەنجێلیتا کە گوێی

لەمانە بوو بە ڕۆمیۆی گوت:{سەگە بچووکەکەیان ئەمەی کردوە، من خۆم دوێنێ لە پەنجەرەکەوە بینیم یاری پێ دەکرد} ڕۆمیۆ بەخێرایی ڕۆیشت بۆ ماڵی خاتوو مادێلا و پێی ڕاگەیاندن کە ئەنجێلیتا دەڵێ سەگە بچووکەکە دوێنێ یاری بە بازنەکە کردووە، پاشان زۆر گەڕان تا بینیان لە ژێر مێزی ژوورەکـەدا بـوو، خاتوو مادێلا و پیاوەکەی زۆر سوپاسی ڕۆمیۆ و ئەنجێلیتایان کرد، پاشان ڕۆمیۆ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەنجێلیتا پێی گوت:{ڕۆمیۆ دەتوانم داوایەکی ترت لێ بکەم؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بێگومان فەرموو} ئەنجێلیتا گوتی:{بڕۆ بۆ ماڵی بەڕێز بێڵ، ئەوەی شانۆگەری بووکەکان بۆ منداڵان دەکات، ئەمڕۆ ڕۆژی لە دایک بوونی کوڕەزاکەیەتی، چەپکێک گوڵی بە دیاری بۆ ببە لە جیاتی من}، ڕۆمیۆ گوتی:{بەسەرچاو}، ڕۆیشت بۆ ئەو ماڵەی ئەنجێلیتا پێی گوتبوو، لە دەرگایدا بەڕێز بێڵ دەرگـای کـردەوە و ڕۆمیۆ چووە ژوورەوە و بینی لانەی بچکۆلانە لەسەر کورسییەکە دانیشتووە و ڕۆمیۆ بە لانەی گوت:{جەژنی لە دایک بوونت پیرۆز بێت لانە گیان ئەم گوڵانە ئەنجێلیتا بۆی ناردووی} لانە زۆر زۆر دڵخۆش بوو کە بینی ئەنجێلیتا پیرۆزبایی و گوڵی بۆ نـاردووە، بەڕێز بێڵ گوتی:{زۆر سوپاس بۆ تۆ ڕۆمیۆ، تۆ لەگەڵ ئەنجێلیتا خۆشیتان خستە نێو دڵی کوڕەزاکەم، ئەنجێلیتا کچێکی دڵپاکە هەمیشە لە پەنجەرەکەیەوە سەیری دەرەوە دەکات و خۆشی دەبەخشێتەوە، ئەنجێلیتا خەڵکی خۆشدەوێ هەمیشە هەوڵ دەدات بۆ بڵاوکردنەوەی خۆشی لە ناو خەڵکیدا}.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەڕێز بێڵ و لانەی کوڕەزای چوون بۆ لای ئەنجێلیتا، لانە لە نزیکی پەنجەرەکە لەلای ئەنجێلیتاوە دانیشتبوو سەیری دەرەوەی دەکرد و گوتی:{ئەڵڵا باران دەبارێت...، من زۆرم حەز لە بارانە لەبەر ئەوەی باوکم حەزی لە باران بوو، دڵنیام ئێستا باوکم زۆر دڵی خۆشە، هیوادارم بە زووترین کات بگەڕێتەوە لامان} بەڕێز بێڵ گوتی:{منیش هیوادارم کچە شیرینەکەم} بەڕێز بێڵ خۆی پێ ڕا□□گیرنەکرا دەستی کردبە گریان و ڕۆیشتە دەرەوە و لەسەر پلیکانەکانی دەرەوە دانیشت

و ئەنجێلیتا بە دوایدا ڕۆیشت و لە تەنیشتی دانیشت گوتی:{باپیرە گیان! چیرۆکەکانی تۆ زۆر خۆشن و بەرەو یادگاری کۆنم دەبەنەوە} بەڕێز بێڵ گوتی:{زۆر چاکەئەنجێلیتا... من دەمەوێ ئەمجارەیان چیرۆکێکی ڕاستەقینەت بۆ بگێڕمەوە، چیرۆکێکی زۆر غەمگینە باس لە پیاوێک دەکات توشی هەڵەیەک بووە تا ئێستاش پەشیمانە، ئێمە کارمان یاری بووکە شووشە و چیرۆک گێڕانەوە بوو بۆ منداڵان، لیۆنۆی کوڕم یارمەتی دەدام کە گەشتمان دەکرد بۆ شارەکان، ئیتر بەو شێوەیە منداڵان لە دەورمان کۆدەبوونەوە و یاریمان بۆ دەکردن، من ئەو کارەم زۆر بە لاوە خۆش بوو چونکە خەندەی دەخستە سەر لێوی منداڵان، لانەی بچکۆلەش هەمیشە لەگەڵمان بوو لە گەشتەکان لە دوای ئەوەی دایکی کۆچی دوایی کرد، بەڵام لیۆنۆی کۆڕم هەستی دەکرد کە ئەو کارە لە ئاستی ئەودا نییە و خۆزگە خواز بوو ببێت بە دکتۆر منیش داوام لێکردبوو واز لە خوێندن بهێنێت و بووکەڵەکان چاک بکاتەوە،بەڵام ڕۆژێک لانەی کچی توشی نەخۆشیەکی سەخت بوو و لیۆنۆی باوکی زۆر بە غەمبارییەوە سەیری دەکرد و نەیدەتوانی هیچی بۆ بکات پاش چەند ڕۆژێک لانە تەندروستی باش بوو و لیۆنۆش بڕیاری یەکجارەکی دا کە دەبێ ببێت بە دکتۆر من بەو بڕیارەی زۆر نیگەران بووم بە توڕەییەوە گوتم:(دەتەوێ بەجێمان بهێڵیت؟ باشە بڕۆ تۆ مرۆڤێکی خۆپەرستی نامەوێ جارێکی تر بتبینمەوە لێرە بڕۆ). ئیتر ڕۆیشت و لەو ڕۆژەوە هەتاکو ئێستا نەم بینیوەتەوە دەڵێن گەڕاوەتەوە ئەم شارە بەڵام نازانم لە کوێیە!} ئەنجێلیتا زۆر بە وردی گوێی بۆ گرتبوو.

بۆ بەیانی ئەنجێلیتا داوای لە ڕۆمیۆ کرد کە لیۆنۆی باوکی لانە بدۆزێتەوە ڕۆمیۆ گوتی:{باشە من هەوڵ دەدەم بیدۆزمەوە و بە هاوڕێکانیشم دەڵێم کە یارمەتیم بدەن} پاشان ڕۆیشت بۆ بنکە تایبەتییەکەی خۆیان، هاوڕێکانی ڕۆمیۆ کە بەسەرهاتەکەیان زانی هەموو پێکەوە بڕیاریاندا بەدوای باوکی لانە دا بگەڕێن دوای چەند ڕۆژ گەڕان و پرسیارکردن هیچ کەسێکیان لیۆنۆ یان نەدۆزیەوە ڕۆژێک ئەلفرێدۆ بە ڕۆمیۆی گوت:{ڕۆمیۆ گیان

تۆ ماندوو نەبووی لەم هەموو گەڕانە؟} ڕۆمیۆ گوتی:{من چۆن ماندوو دەبم بۆ بڵاو کردنەوەی خۆشی، من و ئەنجێلیتا دەمانەوێ خۆشی لە ناو دڵی خەڵک بڵاو بکەینەوە} پاشان گوتی:{ئاە!!!ئەوە چۆن لە بیرم چوو؟ دکتۆر کاستێلا لەوانەیە بزانێت لیۆنۆ کێیە!!} ئینجا ڕۆیشت بۆ لای دکتۆر کاستێلا، خۆشبەختانە دکتۆر کاستێلا لیۆنۆی ناسی و گوتی:{لیۆنۆ دکتۆرێکی زۆر باشە و چارەسەری نەخۆشی منداڵە هەژارەکان دەکات بە خۆڕایی هەروەکوخێر خوازێک} ئینجا ڕۆمیۆی برد بۆ لای، ڕۆمیۆ هەموو شتێکی بۆ دکتۆر لیۆنۆ گێڕایەوە و پێکەوە ڕۆشتنەوە بۆ لای ماڵی بەڕێز بێل، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو خێزانە بە یەکتر شاد بوونەوە.

بۆ بەیانی ڕۆژی لە دایک بوونی ئەنجێلیتا بوو، ڕۆمیۆ ویستی دیارییەکی جوانی پێشکەش بکات بیری کردەوە کە گۆرانییە تایبەتییەکەی خۆی و هاوڕێکانی بۆ بکاتە دیاری، هەربۆیە ڕۆیشت بە هەندێک لە هاوڕێکانی گوت و ئەوانیش خۆشحاڵبوون.

پاشان ڕۆمیۆ و ئەلفرێدۆ و دانکی و میشۆک چاودێری ماڵی بەڕێز ڕۆسی یان کرد تاکو ئەنجلیۆ و دایکی لە ماڵ چوونە دەرەوە، ئەوان لە بیریان نەبوو کە هێشتا بەڕێز ڕۆسی لە ماڵەوەیە، ئینجا ڕۆیشتن بۆلای ئەنجێلیتا،ڕۆمیۆ لە دەرگای دا و گوتی:{ئەنجێلیتا یادی لە دایک بوونت پیرۆز بێت...، با هاوڕێکانمت پێ بناسێنم ئەمە دانکی یە ئەمەش میشۆکە و ئەویش ئەلفرێدۆیە، ئەمانە هەموویان لە دوکەڵکێش پاککردنەوە کار دەکەن} ئەنجێلیتا گوتی:{من پێخۆشحاڵم بە ناسینتان} ئەلفرێدۆ گوتی:{ئێمە بەبۆنەی ڕۆژی لە دایک بوونتەوە هاتوین گۆرانییەکت پێشکەش بکەین کە تایبەتە بە دوکەڵکێش پاککەرەوەکان} لەو کاتەدا دەرگای ژوورەکەی ئەنجێلیتا کرایەوە بینیان بەڕێز ڕۆسی بوو ئەنجێلیتا گوتی:

{ باوکە تکایە سزایان مەدە ئەوان هاتوون بە بۆنەی جەژنی لە دایک بوونمەوە ئاهەنگ بگێرن} بەڕێز ڕۆسی بە دەنگێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی:{نا ..بەمەرجێک لێیان دەبوورم کە گوێم لەو گۆرانییە تایبەتییە بێت} منداڵەکان بە خۆشحاڵییەوە گۆرانییەکەیان گوت، پاشان هەموو بە

دڵخۆشییەوە خوداحافیزییان لە ئەنجێلیتا کرد.

کاتێک ڕۆمیۆ و دانکی و ئەلفریدۆ ڕۆیشتن بۆ ماڵی بەڕێز ماتیۆ و خەریکی ئیش کردن بوون لە ناکاو دانکی گوتی:{من وای بۆ دەچم کە ئەنجێلیتا کچی بەڕێز ڕۆسی نییە .. ئاخر هیچ لەئەوان ناچێت!!، ئەو ماڵە نهێنیەکی گەورە دەشارنەوە، لەوانەیە بەڕێز ماتیۆ بەو نهێنییە بزانێت !!) ڕۆمیۆ بەسەر سوڕمانەوە ڕووی کردە بەڕێز ماتیۆ و گوتی:{ تکایە بەڕێز ماتیۆ ئەگەر نهێنییەک هەیە پێمان بڵێ ئێمە دەمانەوێ یارمەتی ئەنجێلیتا بدەین} بەڕێز ماتیۆ گوتی:{ ڕاستە نهێنییەک هەیە، بەڵام بەڵێنم بە بەڕێز ڕۆسی داوە کە هیچ شتێک نەدرکێنم!} دانکی گوتی:{تکایە پێمان بڵێ. بەڕێز ڕۆسی هەموو شتێک بۆ تۆ دەگێڕێتەوە لەبەر ئەوەی تۆ پیاوێکی زیرەکیت} بەڕێز ماتیۆ بەو قسەیەی دانکی دڵی زۆر خۆش بوو و گوتی:{من زیرەکم؟.. باشە هەرچەندە بەڕێز ڕۆسی داوای لێ کردووم کە هیچ شتێک باس نەکەم بەڵام من دڵنیام کە ئێوە منداڵی باشن و دەتانەوێ یارمەتی ئەنجێلیتا بدەن، ئەو ڕووداوە نزیکەی دە ساڵ لەمەوبەر لە وەرزی زستاندا بوو بەفرێکی زۆر باری بوو من لەو کاتەدا بە نزیک ماڵی ڕۆسی دا ڕۆیشتم کتوپڕ عارەبانەیەکی ڕازاوەم بینی هی یەکێک لە خانەدانەکان بوو ژنێک ناوی خاتوو ئیزابێلا بوو لە عارەبانەکە دابەزی و منداڵێکی دا بە بەڕێز ڕۆسی، گوێم لێبوو بەڕێز ڕۆسی گوتی: من چی لەم منداڵە بکەم؟!! بەڵام خاتوو ئیزابێلا وەڵامی نەدایەوە و ڕۆیشت، نازانم ئەو خاتوونە بۆچی ئەو منداڵەی دابە بەڕێز ڕۆسی، لەڕاستیدا ڕۆسی هاوڕێشم تا ئێستا هیچ شتێکی لەم بارەیەوە بۆ باس نەکردووم، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە زانی من بینیومە داوای لێکردم ئەو نهێنییە بپارێزم . ئێستا زانیتان ئەنجێلیتا کچی ڕاستەقینەی ڕۆسی نییە؟ بەڵکو ئەو کچی یەکێک لە دەوڵەمەندەکانە!}. منداڵەکان تووشی سەرسوڕمان ببون لەو بەسەرهاتە!!.

ڕۆمیۆ بە دڵتەنگییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ویستی بڕوات بۆ لای ئەنجێلیتا بەڵام گوێی لە دەنگی بەڕێز ڕۆسی بوو کە قسەی لەگەڵ ئەنجێلیتا دەکرد

و بەڕێز ڕۆسی دەیگوت:{ئێستا پێویستە بڕۆم ئەنجێلیتا گیان} ئەنجێلیتا گوتی:{باوکە! من دەزانم ئێستا تۆ بۆ کوێ دەچیت، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە دەچیت بۆ لای خاتوو ئیزابێلا وەکو هەموو ساڵێک ئەی وانیە؟} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{ڕاستە بەڵام تۆ ئەمەت چۆن زانی؟} ئەنجێلیتا گوتی:{ئەمە هەموو ساڵێک ڕوو دەدات، چونکە تۆ هەموو ساڵێک لە ڕۆژی لەدایک بوونم دا دەڕۆی بۆ سەردانی خاتوو ئیزابێلا، باوکە گیان! لە هەموو جارەکاندا ئاواتم ئەوە بووە لەگەڵتدا بێم، گوێ بگرە باوکە گیان تکا دەکەم بە خاتوو ئیزابێلا بڵێ کە ئەنجێلیتا خەون بە تووە دەبینێ و تاکە ئارەزووی ئەوەیە کە تەنها بۆ جارێکیش بێت بتبینێت پێی بڵێ کە من هەموو کاتێ بیری دەکەم و گوێ دەگرم لەو مۆسیقایەی بە دیاری بۆی نادووم، من وا هەست دەکەم زۆر لەئەو نزیکم} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{دڵنیابە هەمووی پێ دەڵێم} ئینجا ڕۆمیۆ زانی بەڕێز ڕۆسی دەچێت بۆ لای خاتوو ئیزابێلا، بڕیاری دا دوای بکەوێت، ئەنجێلیتا لە پەنجەرەکەیەوە بینی کە ڕۆمیۆ بە دوای بەڕێز ڕۆسی دا ڕۆیشت، کاتێ بەڕێز ڕۆسی گەیشتە لای کۆشکەکەی خاتوو ئیزابێلا ڕۆمیۆ زۆر غەمبار بوو لەبەر ئەوەی پاسەوانێک لە لای دەرگای کۆشکەکە بوو و ڕۆمیۆ نەیدەتوانی بڕواتە ژوورەوە بەڵام لە ناکاو گوێی لە دەنگی خزمەتکاری کۆشکەکە بوو کە بە پاسەوانەکەی دەگوت دوکەڵکێشەکەمان گیراوە ڕۆمیۆ بە دڵخۆشیەوە هاواری کرد و گوتی:{ دوکەڵکێش پاک دەکەمەوە! کێ پێویستی پێیەتی؟ دوکەڵکێش پاک دەکەمەوە!} خزمەتکارەکە کە گوێی لە دەنگی ڕۆمیۆ بوو یەکسەر بانگی کرد و پێکەوە چوونە ناو کۆشکەکەوە بەڵام کاتێ ڕۆمیۆ لە دوکەڵکێشەکە هاتە خوارەوە بینی دیکۆرۆ لە ناو جانتاکەی نەماوە، دەستی کرد بە گەڕان بە دوایدا و پاش گەڕانێکی زۆر لە ژوورێکدا دۆزیەوە گوێی لە دەنگە دەنگێک بوو بەرەو ئەو ژوورە دەهاتن ڕۆمیۆ زۆر ترسا ڕایکردە پشت قەنەفەیەکەوە و خۆی شاردەوە بینی خاتوو ئیزابێلا و بەڕێز ڕۆسی هاتنە ژوورەوە، خاتوو ئیزابێلا دەستی دایە کیسەیەک پارە و گوتی:{بگرە ئەمە پارەی ساڵی داهاتووە

ئەنجێلیتای پێ بەخێو بکە} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{سوپاس} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{پێویست بە سوپاس ناکات ڕۆسی ئەمە ئەرکی سەر شانی منە وەک داپیرەی بەرامبەر بە ئەنجێلیتای کوڕەزام} بەڕێز ڕۆسی چووە پێشەوە هەتاکو پارەکە وەربگرێت بەڵام پێش ئەوەی پارەکە وەربگرێت گوتی:{خاتوون تکا دەکەم گوێم بۆ بگریت.....} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{ها چییت دەوێ؟.. ئەها!! تێ گەیشتم چییت دەوێ! تۆ پارەی زیاترت دەوێ؟) بەڕێز ڕۆسی گوتی:{نا. نا ..نەخێر.. ئەمە پەیوەندی بە پارەوە نییە، ئەوەی ڕاستی بێت ئەنجێلیتای کوڕەزات حەز دەکات چاوی پێت بکەوێت چەند ساڵێکە بنەچەی خێزانەکەیانی زانیوە و بە هیچ شێوەیەکیش باسی ئەمەی لای من نەکردووە بەڵام دەزانم کە هەمیشە بیری لێدەکاتەوە حەز دەکات بتبینێت، ئەنجێلیتا تۆی خۆش دەوێ و هەمیشە خەوت پێوە دەبینێت ئەمڕۆ یادی لەدایک بوونێتی و هیوادارم کە هەواڵێکی خۆشی پێ بگەیەنم بەوەی کە چاوی بە داپیرەی بکەوێت ئەمەش جوانترین دیاری دەبێت بۆ ئەنجێلیتا لە ڕۆژی لەدایک بوونیدا، تکات لێدەکەم خانمەکەم جوان بیری لێ بکەرەوە ئەنجێلیتا گوناهە} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{زۆرچاکە! من باش تێگەیشتم ئەو ئێستا وای لێهاتووە کە حاڵی بێت لەوەی بیر لە سەروەت و سامانی بنەماڵەی مۆتۆڤانی بکاتەوە!!} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{نەخێر خانمەکەم} خاتوو ئیزابێلا نەیهێشت قسەکانی تەواو بکات و گوتی:{ ڕاستە ئەنجێلیتا کوڕەزامە و کچی ئەدۆلفۆیە بەڵام ئەو کچی جوتیارێکی هەژار بووە و باش ئەم ڕاستیەشی پێ ڕابگەیەنە من هەرگیز نیەتم نیە هیچ بەشێک ببەخشم بە ئەنجێلیتا لە سامانی مۆتۆڤانی ها پارەکە بگرە و بگەڕێوە بۆ ماڵەوە} بەڕێز ڕۆسی بە نیگەرانییەوە ویستی بڕوات بەڵام لەو کاتەدا ڕۆمیۆ لە پشت قەنەفەکەوە هاتە دەرەوە و گوتی:{کەمێک چاوەڕوان بکە! ئەنجێلیتا پارەی ناوێت و قەت بیر لەوەش ناکاتەوە، ئەنجێلیتا کچێکی دڵنەرمە و قەت درۆ ناکات} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{تۆ کێی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{ناوم ڕۆمیۆیە و لە دوکەڵکێش پاککردنەوە لەگەڵ بەڕێز ڕۆسی کار دەکەم} خاتوو ئیزابێلا هاواری کردو گوتی:{کەواتە

ئێرە شوێنی تۆ نییە خێراکە برۆ دەرەوە دەی} ڕۆمیۆ گوتی:{خانمەکەم!من دەزانم تۆ زۆر زۆر دەوڵەمەندی بەڵام ئەنجیلیتا هەرگیز گرنگی بەمانە نادات چونکە ئەو تۆی بە ڕاستگۆیی خۆش دەوێ ئەنجیلیتا زۆر بەڕێزە} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{تۆ دڵنیایت؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵێ} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{تۆ کوڕێکی زۆر سەیری! باشە ئەگەر قسەکانت ڕاست نەبێت چی دەکەی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{گیانی خۆم دەبەخشم لە پاداشتی ئەمە} خاتوو ئیزابێلا دەمانچەکەی لەناو سەندوقەکە دەرهێنا و ڕووی کردە ڕۆمیۆ و گوتی:{تۆ زۆر بە چاو نەترسانە قسە دەکەی ئایا متمانەت بە خۆت هەیە؟. ئێستا بۆم بسەلمێنە دەی!؟} ئینجا گوتی:{هەر کەسێک کە سامانێکی زۆر دەبینێت سۆز و وەفا لە بیر دەکات تۆ گوتت گیانی خۆم دەکەمە قوربانی لە پێناوی ئەوەی بیسەلمێنی کە ئەنجیلیتا چاوی لە پارەی من نیە زۆر باشە بچکۆل!} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵام ئەنجیلیتا جیاوازە!؟. بمکوژە بەڵام باوەڕم پێ بکە! من ئامادەم دەی ئێستا تەقەم لێ بکە!} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{بەسە واز بێنە ڕۆمیۆ} بەڵام ڕۆمیۆ گوتی:{دەی تەقەم لێ بکە} پاشان چاوەکانی داخست خاتوو ئیزابێلا گوتی:{زۆر چاکە} گوللەیەکی تەقاند بەڵام کاتێ ڕۆمیۆ چاوەکانی کردەوە بینی تەقەی بۆ ئاسمان کردووە پاشان خاتوو ئیزابێلا گوتی:{ئێوە هەردووکتان بێ مێشکن دەی خێراکەن برۆنە دەرەوە} ئەوانیش ڕۆیشتن لە ڕێگا لە لای پردەکە ڕاوەستان و بەڕێز ڕۆسی گوتی:{تۆ بۆچی واتکرد؟ خۆ تۆ خەریک بوو توشی کارەساتێکمان بکەیت!؟} ڕۆمیۆ گوتی:{ داوای لێبووردن دەکەم} پاشان گوتی:{مامۆستا! من تێنەگەیشتم کە خاتوون بۆچی ئاوها هەڵسوکەوتی کرد!!، بۆچی تەقەی لە من نەکرد؟!} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{بۆچی تۆ دەتویست بەڕاستی تەقەت لێ بکات؟} ڕۆمیۆ گوتی:{لە ڕاستیدا من ئەو کاتە هیچ گرنگییەکم بە خۆم نەدەدا ئەگەر واشی بکردایە بەڵام ئێستا زۆر دەترسم} بەڕێز ڕۆسی پێکەنی گوتی:{خاتوو ئیزابێلا تۆی تاقی کردەوە وابزانم لە تاقیکردنەوەکەش سەرکەوتوو بوویت} پاشان بەسەرهاتی دایک و باوکی ئەنجیلیتای بۆ ڕۆمیۆ گێڕایەوە و

گوتی:{باوکی ئەنجێلیتا کوڕێکی زۆر زیرەک بوو کوڕی ئیزابیلا لە ژێر نازی دایکی بەخێو کرابوو و تا گەورەبوو، ڕۆژێک بە دایکی گوت:دایە گیان ئەمە جۆڤانایە کە پێشتر بۆم باس کردبووی، جۆڤانا کچە جوتیارێک بوو لە بنەماڵەیەکی زۆر هەژار، ئەدۆلفۆش جوانی و ڕەوشتی بەرزی جۆڤانای چووبووە دڵەوە و بڕیاری دا بیخوازێت بەڵام دایکی بەهیچ جۆرێک ڕازی نەبوو چونکە لە بنەماڵەیەکی هەژار بوون، باوکی ئەنجێلیتا گرنگی نەدا بە قسەی بنەماڵەکەی و جۆڤانای کردە هاوسەری خۆی و دواتر منداڵێکیان بوو ناویان نا ئەنجێلیتا، خاتوو ئیزابێلا بەردەوام بوو لەسەر دژایەتی کردنیان و ڕێگەی بەوان نەدا لەگەڵیدا بژین و لە کۆشکەکە وەدەری نان پاش چەند ساڵ هەواڵیان بۆ هێنان کە جۆڤانا و ئەدۆلفۆ بە نەخۆشی کۆچی دواییان کردووە} ڕۆمیۆ زۆر غەمبار بوو ئیتر و ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە و یەکسەر ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی ئەنجێلیتا بینی خەوتووە و زۆر بە دڵتەنگییەوە و لە لەبەر خۆیەوە گوتی:{ ئەنجێلیتا تۆ هەوڵ دەدەی ئاسودەیی لە ناو خەڵکدا بڵاو بکەیتەوە هەرچەندە دەناڵێنی بە ئازارێکی زۆرەوە، منیش بەردەوام یارمەتیت دەدەم هەرچۆنێک لە تواناما هەبێت بەڵێن بێت} کە ئەنجێلیتا جوڵایەوە ئەو پەرتووکەی بە دەستییەوە بوو کەوتە خوارەوە ڕۆمیۆ هەڵیگرتەوە و ویستی بیخوێنێتەوە بەڵام یەکسەر پەرتووکەکەی داخست و گوتی:{بۆم نییە بیرەوەری کەس بخوێنمەوە بەبێ پرس!} ئەنجێلیتا لەوکاتەدا خەبەری بووە وە دەستی برد بۆ پەرتووکەکە ڕۆمیۆ گوتی:{داوای لێبوردن دەکەم ویستم بیخوێنمەوە بەڵام پەشیمان بوومەوە} ئەنجێلیتا گوتی:{خۆم بۆتی دەخوێنمەوە} ئینجا دەستی کرد بە خوێندنەوە:{ئێستاکە تەمەنم بووە بە یانزە ساڵ وا هەست دەکەم ڕۆژ بە ڕۆژ نەخۆشییەکەم توندتر دەبێت و خراپتر دەبم..} ڕۆمیۆ قسەکانی پێ بڕی و گوتی:{نا..نا..ئەنجێلیتا} ئەنجێلیتا گوتی:{واز بێنە باقسەکانم تەواو بکەم! وا هەست دەکەم من چیتر ناتوانم بەرگەی نەخۆشییەکەم بگرم ژیانیش بەجێ دێڵم} ڕۆمیۆ هەستایەوە و گوتی:{چی؟..} ئەنجێلیتا گوتی:{من نەخۆشییەکەی خۆم باش دەناسم خۆت دڵتەنگ مەکە

ڕۆمیۆ! من تاکە ئاواتێکم هەیە ئەمەوێ پێتی بڵێم، ڕۆمیۆ ئەو مۆسیقایەم بۆ بێنە} ڕۆمیۆ مۆسیقاکەی بۆ هێنا و ئەنجێلیتا گوتی:{سوپاس! ئەم مۆسیقایە دیاری داپیرەمە، باوکم لە ڕۆژی لەدایک بوونی دا پێشکەشی داپیرەمی کرد و ئەویش بە دیاری دایبە من، مۆسیقایەکی خۆشە کاتێ کە گوێی لێ دەگرم وادەزانم داپیرەم گۆرانیم بۆ دەڵێ تاکو بخەوم. وێنەکەی دێتە پێش چاوم! ڕەنگی قژی.. چاوە بەهێزەکانی.. تواناى! ئەو خەندە جوانەی کە لە خەندەی من دەچێت، ئەو کاتە هەست بە بەختەوەری دەکەم .. کاتێ سەیری خۆرئاوابوون دەکەم وا هەست دەکەم کە ئەویش لەگەڵمدا سەیری دەکات لەوانەیە ئەمە دوور بێت لە ڕاستی بەڵام من حەز دەکەم وا خەیاڵی بکەم لەو کاتەشدا وا هەست دەکەم کە داپیرەم منی خۆش دەوێ...} لەو قسانەدا بوو کە هێزی نەما و کەوتە سەر سیسەمەکەی،ڕۆمیۆ زۆر ترسا ویستی بڕوات بە بەڕێز ڕۆسی بڵێت کە ئەنجێلیتا نەخۆشە بەڵام ئەنجێلیتا گوتی:{ڕۆمیۆ ڕاوەستە! من تاکە ئاواتم ئەوەیە کە داپیرەم ببینم پێش ئەوەی تەندروستیم خراپ بێت، داوای لێبووردن دەکەم ئەمە داوایەکی قورسە بەڵام ئەمە تەنیا ئاواتی منە} ڕۆمیۆ گوتی:{ئەنجێلیتا بەڵێنت پێ دەدەم کە دەیبینیت! هەموو هەوڵم دەدەم کە بیبینیت} ئینجا ڕایکرد و بە بەڕێز ڕۆسی گوت کە ئەنجێلیتا تەندروستی خراپە، بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش ماوەیەک تەندروستی باشتر بوو.

پاشان ڕۆمیۆ ڕۆیشت بە ئەلفرێدۆی گوت:{ئەنجێلیتا تەنیا ئاواتی ئەوەیە خاتوو ئیزابێلا ببینێت..وابزانم ئەمە دوایین ئاواتێتی لەم ژیانە و دەبێت بیبەن بۆ کۆشکەکەی}، ئەلفرێدۆ پەیمانی بە ڕۆمیۆ دا کە یارمەتی دەدات و هەر لەو کاتەدا دانکی و میشۆک و ئۆرتۆ هاتن و گوتیان:{ئێمەش یارمەتیتان دەدەین! ئەی ئێمە پەیمانمان نەدا کە یارمەتی یەکتر بدەین؟} ڕۆمیۆش بە خۆشحاڵیەوە گوتی:{من زۆر سوپاستان ئەکەم هاوڕێیان!}،

بۆ ئێوارە کاتێ ڕۆمیۆ چووە ژوورەکەی ئەنجێلیتا بینی بە جوانترین شێوە خۆی ڕازاندبۆوە و ئەنجێلیتا پێکەنی و گوتی:{ئەوە چیتە ڕۆمیۆ بەو شێوەیە سەیرم مەکە} ڕۆمیۆ گوتی:{واو. ئەنجێلیتا چەندە جوانیت!} ئینجا بە هێواشی لەماڵەکە چوونە دەرەوە و لەگەڵ ئەلفریدۆ و دانکی و میشۆک و ئۆرتۆ بەڕێکەوتن بۆ کۆشکی خاتوو ئیزابێلا تا گەیشتنە بەردەرگای کۆشکەکە بەڵام پاسەوانی کۆشکەکە ڕێگەی پێنەدان بچنە ژوورەوە و ڕۆمیۆ گوتی:{من کۆڵ نادەم و هەر دەبێ بچینە ژوورەوە} پاشان بە چەند پیلانێک ڕۆمیۆ و ئەنجێلیتا چوونە ژوورەوە، بەڵام ئەنجێلیتا دیسان نەخۆش کەوت ئیتر نەیتوانی بڕوات لەبەر ئەوە ڕۆمیۆ بە ئەنجێلیتای گوت:{تۆ دانیشە ئەنجێلیتا من دەچم بە دوای داپیرت دەگەڕێم و دەیدۆزمەوە}



ئەنجێلیتا گوتی:{باشە} ڕۆمیۆ ڕۆیشت و دیکۆرۆش کە لەلای ئەنجێلیتا بوو ڕایکرد بەرەو لایەکی تری کۆشکەکە ئەنجێلیتا بە دوایدا ڕۆیشت هەتا بیهێنێتەوە بەڵام دیکۆرۆ لە لای دەرگای ئەو ژوورە ڕاوەستا کە خاتوو ئیزابێلای لێ بوو، سەگەکەی ئیزابیلا هاتە دەرەوە و بەرەو ڕووی ئەنجێلیتا ڕۆیشت ئەنجێلیتا بانگی سەگەکەی کرد و گوتی:{سەگە باشەکە وەرە بۆ لام تۆ سەگێکی باش دیاریت ..من ئەنجێلیتام ئەی تۆ چیت پێ دەڵێن؟} لەو کاتەدا خاتوو ئیزابێلا گوێی لە ئەنجێلیتا بوو سەری سوڕما گوتی:{ئەوە دەنگی ئەوە ..!!! من دڵنیام} ئینجا هاتە دەرەوە و ئەنجێلیتای بینی، ئەنجێلیتا گوتی:{خاتوو ئیزابێلا! من ئەنجێلیتام هاتووم بۆ ئێرە هەتا داپیرەم ببینم} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{من بڕوا ناکەم کە ئەمە پاڵی بە تۆوە نابێت بۆ ئەوەی بێیت بۆ ئێرە، من بە هیچ شێوەیەک ناتوانم مامەڵە لەگەڵ تۆدا بکەم وەکو کوڕەزام! ئیتر من لەمە زیاتر هیچم نەماوە پێتی بڵێم

دەی برۆ دەرەوە} ئەنجێلیتا ئامێرە مۆسیقاکەی لە جانتاکەی دەرهێنا و داوای لە داپیرەی کرد بیپارێزێت ئینجا لەگەڵ ڕۆمیۆ ڕۆیشتنە دەرەوە، بەڵام لە ڕێگا ئەنجێلیتا دووبارە نەخۆش کەوت ڕۆمیۆ زۆر بە خێرایی گەڕاندیەوە بۆ ماڵەوە ڕۆیشت دکتۆر کاستێلای بانگ کرد بۆ ئەوەی چارەسەری ئەنجێلیتا بکات، دکتۆر کاستێلا دوای ئەوەی پشکنینی بۆ ئەنجێلیتا کرد گوتی:{ئەوەی لە توانامدا بوو کردم چارەسەریش تەنها لای خودایە، بەڵام ئەگەر بە بەردەوامی ئاوا بمێنێتەوە حاڵی ترسناک دەبێت، ڕوخساری زۆر هێمن و بێدەنگە وەک ئەوەی هەست بە خۆشییەکی زۆر بکات، پێویستە بیبەنە لای پسپۆری نەخۆشییەکانی دڵ، من پزیشکێکی زۆر باش دەناسم لە پاریس} بەڵام بەڕێز ڕۆسی دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو کە ئەنجێلیتا ببات بۆ پاریس.

بۆ بەیانی هەموو هاوڕێیانی دەستەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان چوونە پێش کۆشکەکەی خاتوو ئیزابێلا و داوایان لە خاتوون دەکرد کە بڕوات ئەنجێلیتا ببینێت خاتوو ئیزابێلا هاتە دەرەوە گوتی:{کێ لێپرسراوە بەرامبەر ئەم کارە؟} ئەلفریدۆ گوتی:{من!} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{ ناوت چییە؟ و چی وای لێکردن ئەم ئاژاوەیە بنێنەوە لەناو کۆشکەکەم؟} ئەلفریدۆ گوتی:{ناوم ئەلفریدۆیە، ئێمە هیچمان لە تۆ ناوێ خاتوون تەنها ئەوە نەبێ کە بچیت ئەنجێلیتا ببینیت و قسەی لەگەڵ بکەیت} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{کەواتە ڕۆمیۆ نەخشەی بۆ ئەم کارە ناشرینە کێشاوە!} ئەلفریدۆ گوتی:{نەخێر! ڕۆمیۆ هەر نازانێت ئێمە لێرەین} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{پاسەوان گوێ بگرن بە زووترین کات ئەم منداڵانە لە کۆشکەکە دەربکەن} ئینجا چووە ژوورەوە.

پاسەوانەکان بە منداڵەکانیان گوت:{دەی گوێتان لە قسەکانی خاتوون نەبوو؟ هەستن بڕۆنە دەرەوە دەی} دانکی گوتی:{نەخێر! من هەرگیز داپیری ئەوەندە دڵڕەقم نەبینیوە!!} خاتوو ئیزابێلا کە گوێی لەم قسانە بوو لە جێگاکەی خۆی ڕاوەستا،میشۆک گوتی{ئەمە ڕاستە! ئەگەر من نەخۆش بکەوم داپیری من شەو تا بەیانی ناخەوێت و ئاگای لە من

دەبێت}، ئیتر هەموویان باسی داپیری بە بەزەیی و باشی خۆیان کرد ئەو قسانە کارێکی زۆری کردە سەر دڵ و دەروونی خاتوو ئیزابێلا، لەو کاتەدا گوێی لە دەنگی ڕۆمیۆ بوو کە بەرەو ئەوێ دەهات،ڕۆمیۆ گوتی:{بوەستن! لەبەر چی ئێوە ئەم کارەتان کردووە؟ ئەگەر ئەنجێلیتا بەمە بزانێت زۆر نارەحەت دەبێت، چونکە ئەو داپیرەی زۆر خۆش دەوێت و نایەوێ کەس بێزاری بکات، دەزانن ئەو چی بە من گوتووە؟ گوتی ئەو کاتە زۆر دڵخۆشم کە چاوەکانم دادەخەم و بیر لە داپیرم دەکەمەوە هەست دەکەم کە داپیرم سەرەڕای ئەو هەموو سەروەت و سامانەی هەیەتی هیچ دڵخۆش نییە چونکە ئەو تەنهایە، ئەمەش ئەنجێلیتا زۆر بێتاقەت دەکات، ئەنجێلیتا تاکە کەسێکە کە خاتوو ئیزابێلای خۆش بوێت و بیری لێ بکاتەوە} خاتوو ئیزابیلا هاتە دەرەوە و گوتی:{ڕۆمیۆ!} ڕۆمیۆ ئاوڕی دایەوە و بە سەرسوڕمانەوە گوتی:{ خاتوو ئیزابێلا؟} ئینجا گوتی:{ئەنجێلیتا زۆر نەخۆشە و پێویستی بە بینینی تۆیە!؟} منداڵەکانی تریش هەموویان گوتیان:{پێویستە ببیبنیت!} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{زۆر سەیرە! باشە ئێوە پەیوەندییتان چییە بە ئەنجێلیتاوە ئەم هەموو شتە سەیرە دەکەن لە پێناویدا؟} دانکی گوتی:{چونکە ئەنجێلیتا کچێکی باشە و خۆشی بۆ هەموو کەسێک دەوێ خانمەکەم!}



ئەلفریدۆ گوتی:{خانمەکەم! ئێمە منداڵی هەژاریین و لە شوێنی دوورەوە هاتووین بۆ ئەوەی لێرە لە دوکەڵکێش پاککردنەوە کار بکەین، قەدەر ئێمەی لێرەدا کۆکردەوە و ڕۆمیۆ یەکەم کەس بوو کە پێی گەیشتم و خۆشەویستی و دڵسۆزی و بەهێزی ئەو وای لێکردم کە متمانەی زۆرم پێی هەبێت، ئەنجێلیتا یارمەتی ڕۆمیۆی دا، ئەمە مانای ئەوەیە کە یارمەتی هەموومانی داوە، ئێمە هەموومان وەک یەکین} ڕۆمیۆ گوتی:{خانمەکەم!

ئەنجێلیتا زۆر نەخۆشە و وادەزانێ بەم زووانە لە ژیاندا نامێنێت بەڵام تا ئێستا هەر دەمی بەخەندەیە و هەوڵ دەدات دڵی دەور و پشتی خۆش بکات تا ئێستاش هەر لەسەر جێگا کەوتوە و نەخۆشە لەگەڵ ئەوەشدا هەر ناوت دێنێت و داوای بینینت دەکات، خانمەکەم! توخوا دڵت بۆ ئەم کچە پاک و بێگەردە بکەرەوە توخوا!}ئینجا هەموویان داوایان لە خاتوون کرد کە یارمەتی ئەنجێلیتا بدات خاتوو ئیزابێلاش ئەم قسانە کاریان تێکرد و گوتی:{باشە من چیم لەدەست دێت بۆی بکەم؟}



ڕۆمیۆ گوتی:{دەتوانی سۆز و خۆشەویستی خۆتی پێشکەش بکەیت جگە لەمە هیچی ناوێت} خاتوونیش گوتی:{باشە چۆن ئەمە بکەم؟} ڕۆمیۆ زەردەخەنەیەک هاتە سەر لێوانی و گوتی:{ئەمەیان خۆت باشتر دەزانیت!؟} ئینجا هەموویان بەڕێکەوتن بەرەوماڵی بەڕێز ڕۆسی، خاتوو ئیزابێلا ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی ئەنجێلیتا گوتی:{ئەنجێلیتا!}
ئەنجێلیتا بەخەبەر هات و گوتی:{داپیرە گیان!} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{داوای لێبوردنت لێ دەکەم ئازیزەکەم، تۆ بە هۆی منەوە ئازارێکی زۆرت کێشا توخوا بمبوورە ئەنجێلیتا گیان}.

ئەنجێلیتا گوتی:{نا.. وا پێ دەچێت ئەمەی کە دەیبینم خەو نەبێت ئەمجارە!!!} خاتوون دەستی کردبە گریان گوتی:{ئەنجێلیتا گیان ئیتر من هەمیشە لەگەڵتدا دەبم} پاشان گوتی:{بەڕێز ڕۆسی من ئەم چاکانەی تۆم هەمووی لەبەر چاوە، دەزانم ڕۆژانێکی زۆر بوو لە ناو هەڵە دا دەژیام بەڵام لە میانەی ئەو ماوەیەدا شتێکم بۆ دەرکەوت ئەویش ئەو متمانەیە بوو کە بە تۆم بەخشی تۆش وەفات بۆم هەبوو} بەڕێز ڕۆسی گوتی:{نا. نا ..خانم قسەی وا مەکە من تەنها بە کاری خۆم هەستاوم } ئینجا خاتوون پێکەنی و

ڕووی کردە دکتۆر کاستێلا و گوتی:{تۆ دڵنیای ئەم نەخۆشییەی ئەنجێلیتا لە پاریس چارەسەری هەیە؟} دکتۆر کاستێلا گوتی:{ بەڵێ هیوای چاک بوونەوەی زۆرە} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{زۆر چاکە من دەیبەم بۆ پاریس} ئینجا ڕووی کردە ئەنجێلیتا و گوتی:{مەترسە کچە خۆشەویستەکەم من هەرچی لە تواناماندا هەبێت بۆتۆی دەکەم} ئەنجێلیتا گوتی:{زۆر سوپاست دەکەم داپیرە گیان دەمەوێ تا کاتی ڕۆیشتنمان بۆ پاریس لەم خانووە جوانە بمێنمەوە لەگەڵ بەڕێز ڕۆسی و خاتوو ئیدا توخوا داپیرە گیان من وا حەز دەکـەم} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{چۆنت دەوێ با ئـاوا بێت ئازیزەکەم} ئینجا ڕۆیشتەوە بۆ کۆشکەکەی کاتێک شەو داهات ئەنجێلیتا لە جێگاکەی خۆی هەستا و چووە ژوورەکەی ڕۆمیۆ و گوتی:{ ڕۆمیۆ کاتی ڕۆیشتنمان نزیک بۆتەوە دەمەوێ چەند قسەیەکت لەگەڵ بکەم! دەزانی لەو کاتەوەی تۆم ناسیوە شتی زۆرمان بەسەر هاتووە؟ خۆش. و ناخۆش} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵێ ڕاست دەکەی} ئیتر هەتا بەیانی بەیەکەوە قسەیان کرد.

بۆ بەیانی ئەنجێلیتا لەگەڵ داپیـری ڕۆیشت بۆ پاریس و ڕۆمیۆی بەجێهێشت... پایز تێپەڕی و زستانی بەستەڵەکیش باڵی بەسەر زەوی میلانۆدا کێشا، ڕۆمیۆ هەر بیری لە ئەنجێلیتا دەکردەوە، ڕۆژێک ڕۆمیۆ بینی خەڵک هەموویان بەرەو شوێنێک دەڕۆن و ڕۆمیۆ خۆی خزاندە ناو خەڵکەکە بۆ ئەوەی بزانێت چی ڕوویداوە. بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکێکی زۆر لەوێ بوون نەیتوانی چاوی بە هیچ شتێک بکەوێت، دواتر تێگەیشت چەند بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند بوون هاتبوون هەتا بەشداری بکەن لە ئاهەنگی شاهانە، لەوکاتەدا پاشا تێدەپەڕی بۆ ئاهەنگەکە، بەڵام نیکیتا لە پێشەوە ڕاوەستا بوو سەیری دەکرد لەپڕ چاوی بە کچێک کەوت زۆر لە ئەلفریدۆ دەچوو و لەگەڵ بنەماڵەی خانەدانەکاندا دەڕۆیشت، ڕۆمیۆ کە وەستابوو دکتۆر کاستێلای بینی، دکتۆر گوتی:{ڕۆمیۆ چۆنی؟ تکایە ئەم کتێبە بگەیەنە بە ئەلفریدۆ و پێی بڵێ کە دەمەوێ بیبینم چونکە زۆر بیری دەکەم} ڕۆمیۆ گوتی:{باشە بەسەرچاو منیش زۆر بیری دەکەم

بەڵام وەستاكەی زۆر خراپە!}، ئینجا ڕۆمیۆ ڕۆیشت بۆ لای ئەلفریدۆ و کتێبەکەی دا پێی، پێکەوە دانیشتن ئەلفریدۆ زۆر دڵی بە کتێبەکە خۆش بوو و گوتی:{گوێ بگرە ڕۆمیۆ ! زانستێکی ڕاستەقینەی مرۆڤە هەرکاتێک زیاتر فێر بوویت هێزت زیاتر دەبێت}پاشان گوێیان لە دەنگی چەند منداڵێک بوو کە لە قوتابخانە دەگەڕانەوە و ڕۆمیۆ گوتی:{ئای چەند دڵخۆشن! ئەوان هەرکاتێ بیانەوێ دەتوانن بخوێنن بەڵام ئێمە ناتوانین، ئەی بۆ ئێمەش وەکو ئەوان نەچینە قوتابخانە؟} ئەلفریدۆ گوتی:{تۆ ڕاست دەکەی بەڵام دڵتەنگ مەبە هاوڕێکەم من دڵنیام ڕۆژێک دادێت هەموو خەونەکانی من دەبێتە ڕاستەقینە، ئێمەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان لە ماڵی خۆمان ڕفێنراوین و هاتووین لێرە کار دەکەین من دڵنیام ڕۆژێک دادێت کە هەموو ئاواتەکانمان بێتە دی} ڕۆمیۆ گوتی:{کەواتە ئەمە خەونی تۆیە ئەلفریدۆ من دڵنیام دەتوانیت بیهێنیتەدی و سەرکەوتوو دەبیت} ئەلفریدۆ گوتی:{بەڵام من بە تەنها ناتوانم، ئایا تۆ یارمەتییم دەدەی؟} ڕۆمیۆ بەسەرسوڕمانەوە گوتی:{ئاخر من دەتوانم؟}.

ئەلفریدۆ گوتی:{بەڵێ دەتوانیت ئەگەر بتەوێ} ڕۆمیۆ گوتی:{زۆر چاکە ئەلفریدۆ من هەموو هەوڵم دەدەم بۆ ئەوەی ئەم خەونەت بهێنمە دی}.

هەر لەو ڕۆژانەدا کاتێک کوورەی ژوورێکی ئوتێلێک لە ئوتێلەکانی میلانۆ گیرابوو بەڕێز ڕۆسی و ڕۆمیۆ چوون هەتاکو پاکی بکەنەوە بەڵام کاتێک ڕۆمیۆ لە پاککردنەوەی کوورەکە تەواو بوو بینی کچی خێزانەکەی ناو ئەو ژووری ئوتێلە هەوڵی ڕاککردن دەدات لە پەنجەرەکەوە ڕۆمیۆ ویستی یارمەتی بدات بە هەرشێوەیەک بێت زۆر بانگی کرد بەڵام کچەکە وەڵامی نەدایەوە و بەردەوام بوو لەسەر خۆ دەربازکردن تا ویستی بەدیوارەکەدا بچێتە خوارەوە بەڵام پێی خلیسکا و کەوت خۆی بە شوێنی ئاوەڕۆی هۆتێلەکە گرتەوە ڕۆمیۆ بەهەمان شێوە دەستیگرت بە شوێنی ئاوەڕۆکە تا دەستی کچەکە بگرێت و نەهێڵێت بکەوێتە خوارەوە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو شوێنەی ڕۆمیۆ دەستی پێوە گرتبوو بەرگەی دووکەسی نەدەگرت بۆیە هەردوکیان کەوتنە خوارەوە هەرچەندە سەلامەت بوون.



بەڵام کچەکە بە تورەییەوە لە ڕۆمیۆی پرسی:{تۆ چ کارێک دەکەی؟} ڕۆمیۆ گوتی:{دوکەڵکێش پاک دەکەمەوە} کچەکە گوتی:{ئای لەوانەیە تۆ براکەم بناسیت؟} لەو کاتەدا ژنێک لەپەنجەرەکەوە هاواری کرد و گوتی:{زووکەن خێراکەن یانکا بگرن ئەو لە دەستمان هەڵات دەی زووکەن بیگرن!} ڕۆمیۆ گوتی:{چی؟! یانکا؟} یانکا هەڵات بەخێرایی ڕۆمیۆ زۆر بانگی کرد بەڵام یانکا لەچاو وون بوو، ئیتر ڕۆمیۆ بەڕاکردن چوو بۆلای ئەلفریدۆ و پێی گوت کە یانکای بینیوە، پاشان تا درەنگانی شەو ئەوان بە دوای یانکادا گەڕان بەڵام نەیان دۆزیەوە.



نەخۆشیەکی کتوپڕ توشی ئەلفریدۆ بوو و ڕۆمیۆ ئەلفریدۆی برد لەسەر کورسیەک داینا ئەلفریدۆ گوتی:{ڕۆمیۆ وابزانم ئێستا کاتی ئەوە هاتووە نهێنییەکەی خۆمت پێ بڵێم، من کوڕی یەکێک لە خانەوادە دەوڵەمەندەکانم من و یانکای خوشکم لەگەڵ دایک و باوکم خێزانێکی بەختەوەر بووین بەڵام ڕۆژێکیان من و یانکا گوێمان لە مامم بوو کە لەگەڵ ئامۆژنم بڕیاریان دابوو کاتێک دایک و باوکم لە ماڵەوەبن خانووەکەی ئێمە بسوتێنن و پاشان بڵێن کە من و یانکای خوشکم ئەم کارەمان کردووە ئێمەش چووین بە دایک و باوکمان ڕاگەیاند بەڵام ئەوان باوەڕیان پێمان نەکرد هەتا ڕۆژێک مامم ماڵەکەمانی سوتاند و باوکیشم کە لەگەڵ دایکم لە ناو ماڵەکەدا بوو دروشمی

خێزانەکەمانی بۆم هەڵدا و پێی گوتم کە بیپارێزم ئێمەش هەڵاتین بە شەو و بە ڕۆژ هەر دەڕۆیشتین و بە دوای شوێنێکدا دەگەڕاین کە ژیانمانی تێدا بەسەر ببەین هەتا ماڵێکمان دۆزیەوە، ئەوان ڕازی بوون بەوەی کە لەگەڵیاندا بژین و منیش پرچە زێڕینەکەی یانکام بڕی بۆ ئەوەی مامم نەیناسێتەوە و ئیتر ئەوەبوو پیاوە ڕەشەکە هات و منی برد، لەو ڕۆژەوە هەتاکو ئێستا من یانکام نەبینیوەتەوە} ڕۆمیۆ گوتی:{من دڵنیام کە یانکا دەدۆزینەوە دەی وەرە با بچین بەدوایدا بگەڕێین}، بەڵام مامی ئەلفریدۆ زووتر یانکا ی دۆزییەوە و دەستگیری کرد، ئەلفریدۆ ڕۆیشتەوە بۆ بنکە تایبەتییەکەی خۆیان و هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ هاوڕێکانی گێڕایەوە ئەوانیش بڕیاریان دا کە یارمەتی ئەلفریدۆ بدەن.

بۆ بەیانی ئەلفریدۆ و هاوڕێکانی پلانێکیان دانا بۆ ئەوەی یانکا ڕزگار بکەن، ئەوەبوو دوای مەترسییەکی زۆر توانیان یەنکا لە ژێر دەستی ئەو دڕندانە ڕزگار بکەن و گەڕایەوە بۆ باوەشی براکەی، بەڵام ئەلفریدۆ نەخۆشییەکی زۆر ترسناکی گرتبوو ڕۆمیۆ بەخێرایی بردی بۆ لای دکتۆر کاستێلا، دکتۆر پێی ڕاگەیاندن کە ئەو نەخۆشییەی ئەلفریدۆ پێویستی بە پشوودان هەیە و داوای لە ئەلفریدۆ کرد جارێ لە ماڵی ئەوان بمێنێتەوە، بەڵام بۆ بەیانی ئەلفریدۆ و یانکا پێکەوە ڕۆیشتن بەرەو بنکەی تایبەتی خۆیان یانکا گوتی:{منیش دەمەوێ ببمە ئەندامێکی دەستەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان} ئەوانیش بە خۆشحاڵییەوە یانکایان وەرگرت ئینجا ئەلفریدۆ گوتی:{من و یانکا دەمانەوێ لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا بچینە لای پاشا و داوای مافی خۆمانی لێ بکەینەوە کە لە لایەن مام مانەوە لێمان زەوت کراوە} ڕۆمیۆ و هاوڕێکانیشی پەیمانیان بە ئەلفریدۆ دا کە یارمەتی بدەن بۆ گەیشتنی بۆ لای پاشا. ئەلفریدۆ داوای لە یانکا کرد بگەڕێتەوە بۆ ماڵی دکتۆر کاستێلا چونکە شوێنی ئەو ماڵی دکتۆر کاستێلایە، لەلایەکی ترەوە پیاوێک هات بۆ لای مامی ئەلفریدۆ و ئەو دروشمەی دا پێی کە خۆی داوای کردبوو بۆی دروست بکات کە هاوشێوەی ئەو دروشمە بوو کە لەلای ئەلفریدۆ بوو.

ئەلفریدۆ هەموو ئەو پیلانەی بۆ هاوڕێکانی گێڕایەوە کە داینابوو،، یانکا ئیشی ئەوە بوو جل بۆ خۆی براکەی بدوورێت، شەوێک پێش ئاهەنگەکە هەموو شتێک ئامادە کرابوو،، یانکا ئەو شەوە بە تورەیی چووە دەرەوە و ئەلفریدۆ

بە دوایدا ڕۆیشت و لێی پرسی:{یانکا تۆ بۆچی ئەوەندە تووڕەیت؟} یانکا گوتی:{تۆ بۆچی هەمیشە گرنگی بە ڕۆمیۆ دەدەیت و کەمتر قسە لەگەڵ من دەکەیت؟ من ڕقم لە ڕۆمیۆیە} ئەلفریدۆ پێکەنی و گوتی:{یانکا گیان تۆ هێشتا لە مانای هاوڕێیەتی تێنەگەیشتووی! دەزانی هاوڕێ چەند خۆشەویستە؟ ڕۆمیۆ یەکەمین کەس بوو کە لێرە من پێی گەیشتم و متمانەم پێی کرد} لەو کاتەدا ڕۆمیۆ هاتە دەرەوە و گوتی:{ئەلفریدۆ خێراکە وەرە ژوورەوە هەموو منداڵەکان چاوەڕێی تۆن!} ئەلفریدۆ بە دڵخۆشییەوە چووە ژوورەوە.
کاتێ ئەلفریدۆ و هاوڕێکانی خوداحافیزییان لەیەکتر کرد، ئەلفریدۆ بەڕێگادا دەڕۆیشت بۆ ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵی وەستاکەی لەناکاو نیکیتای بینی و سڵاوی لێ کرد لەو کاتەدا هەستی بە توندی نەخۆشییەکەی کرد نیکیتا زۆر ترسا و گوتی:{دەچم هەندێک ئاوت بۆ دەهێنم}، لەو کاتەدا جیۆڤانی هات و ئەلفریدۆی بینی پێی گوت:{دەبێ ڕۆژێک شەڕ بکەین و بتبەزێنم بەڵام من ئێستا نامەوێ لەگەڵ کەسێکی نەخۆشدا شەڕ بکەم! دوعا دەکەم کە چاک ببیتەوە هەتاکو شەڕ بکەین} ئەلفریدۆ ڕازی بوو، کاتێ ڕۆژ بووەوە هەموو هاوڕێیانی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان لە شوێنی مەبەست ئامادەبوون تەنها ئەلفریدۆ نەهاتبوو چونکە دەستەی گورگەکان ئەویان گرتبوو و دەیان ویست شەڕی لەگەڵ بکەن، بەڵام جیۆڤانی و نیکیتا بەمەیان نەزانیبوو و کاتێک چوونە لای دەستەی گورگەکان و ڕیۆ بە جیۆڤانی گوت، جیۆڤانی زۆر تووڕە بوو و گوتی دەبێت هەر ئێستا ڕزگاری بکەن .
دوای ئەوەی ڕۆمیۆ زانی ئەلفریدۆ لە لایەن دەستەی گورگەکانەوە گیراوە ڕۆیشت بۆ لای تاسیۆنی و داوای لێ کرد ڕزگاری بکات بەڵام ئەم قسانە بە گوێیدا نەچوو و ڕۆمیۆ ڕایکرد و تاسیۆنی و لیۆردۆ و پۆتینۆش بە دوایدا ڕایانکرد بەڵام ڕۆمیۆ خۆی لێیان شاردەوە و گەیشتە لای ئەلفریدۆ هەرلەو کاتەدا جیۆڤانی و نیکیتا گەیشتنە ئەوێ و بڕیاریاندا ئەلفریدۆ ڕزگار بکەن و ڕۆمیۆ بەند بکەن ڕۆمیۆ بەمە ڕازی بوو ئەلفریدۆ ڕۆیشت بۆ لای یانکا و هاوڕێکانی تری و بەو پیلانەی کە دایانڕشتبوو گەیشتنە باخچەی کۆشەکەکە، ڕۆمیۆ لەولاوە هەموو شتێکی بۆ دەستەی گورگەکان باس کرد و نیکیتا دەستی کردبە گریان و گوتی:{بەداخەوە نەخۆشییەکەی ئەلفریدۆ زۆر ترسناکە! ئەو داوای لێکردم کە بە هیچ کەسێک نەڵێم، تکایە جیۆڤانی با بڕۆین

یارمەتی بدەین پاش ئەوەی ئەم کێشەیەی ئەلفریێدۆ چارەسەر بوو ئەو کاتە شەڕی لەگەڵدا بکە} جیۆڤانی گوتی:{زۆر چاکە دەی هاوڕێیان من و نیکیتا و ڕۆمیۆ دەچین یارمەتی ئەلفریێدۆ دەدەین ئێوەش ئەگەر حەز دەکەن ئەوا وەرن!} ئینجا منداڵەکان هەموویان گوتیان:{باشە ئێمەش دێین!}.

بەڵام مامی ئەلفریێدۆ بەوەی زانیبوو کە ئەلفریێدۆ دەیەوێ بێتە کۆشکەکەوە و فەرمانی بە پاسەوانەکانی دا کە ڕێگە لە ئەلفریێدۆ بگرن و بیکوژن، پاشان ئەلفریێدۆ و یانکا و نیکیتا و ڕۆمیۆ بە یارمەتی هاوڕێیانی دەستەی گورگەکان و دەستەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان توانیان بگەنە ناو کۆشکەکە.

هەر لەو کاتەدا میشۆک لە لای کۆشکەکە ڕاوەستا بوو و بۆ ئەلفریێدۆ دەگریا لەبەر ئەوەی دەیزانی مامی ئەلفریێدۆ لە ناو کۆشکەکەدا بە دوای ئەلفریێدۆدا دەگەڕێ و دەیکوژێت لەناکاو بینی عارەبانەیەک لە پێشی ڕاوەستا خانمێک لەناو عارەبانەکە دابەزی ئەو خانمە خاتوو ئیزابێلا بوو، خاتوون سڵاوی لێکرد و گوتی:{میشۆک ئەوە چی دەکەیت لێرە؟ ئەی بۆچی دەگریت؟} میشۆکی هەموو شتێکی دەربارەی ئەلفریێدۆ بۆ گێڕایەوە خاتوو ئیزابێلا بڕیاری دا کە یارمەتی بدات، کاتێ ئەلفریێدۆ و ڕۆمیۆ و نیکیتا گەیشتە ناو ئەو ژوورەی کە ئاهەنگەکەی تێدا بوو یەکسەر پاسەوانەکانی مامی ئەلفریێدۆ ئەوانیان دەستگیر کرد لەو کاتەدا خاتوو ئیزابێلا هاتە ژوورەوە و فەرمانی دا بە پاسەوانەکانی خۆی کە ئەو پاسەوانانەی مامی ئەلفریێدۆ بگرن و فڕێیان بدەنە دەرەوە مامی ئەلفریێدۆ چووە پێشەوە و پاشا گوتی:{بەخێر بێیت بەڕێز مالیزیۆ باوکم باسی ئەو دیارییەی بۆ کردم کە دایبوو بە براکەت، ئەمەش هێمای پیرۆزی خانەوادەی ئێوەیە وابزانم ئێستا لای جەنابتانە!} مامی ئەلفریێدۆ واتا بەڕێز مالیزیۆ گوتی:{بێگومان ئێمە شانازی بەو دیارییە دەکەین جەنابی سەرۆک} ئینجا ئەلفریێدۆ و یانکا و خاتوو ئیزابێلا چوونە پێش پاشا ئەلفریێدۆ گوتی:{نەخێر ئەمە ڕاست نییە!دروشمی خانەوادەی مارتینێز لای منە!؟.} خاتوو ئیزابێلا گوتی:{داوای لێبووردن دەکەم فەرمانڕەوای بەڕێز! ڕێگە بەو کوڕە بدە بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە!؟..} ئیتر ئەلفریێدۆ بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە .



بەڕێز مالیزیۆ گوتی:{نەخێر ئەمە ڕاست نییە! جەنابی سەرۆک من زۆر ڕێز لە جەنابت دەگرم بەڵام ڕازی نابم لە پێش بەڕێزتان و گەورەکانی ئەم شارە ڕەزیل بکرێم بەهۆی منداڵێک کە نازانێ چی دەڵێت} پاسەوانەکەی پاشا گوتی:{ئایا ئەو دروشمەی لە لای تۆیە دروشمی خانەوادەی مارتینێزە؟} بەڕێز مالیزیۆ گوتی:{بەڵێ ئەمە ئەو دروشمەیە کە براکەم پێش کۆچی دوایی پێشکەشی کردم!} ئەلفرێدۆ گوتی:{نەخێر! دروشمی ڕاستەقینەی خانەوادەی مارتینێزە لای منە گەورەم!} ژنەکەی بەڕێز مالیزیۆ گوتی:{گەورەم من ئێستا بە ئەرکی دەزانم قسەی تێدا بکەم، ئەلفرێدۆ منداڵێکی لاسارە و دایک و باوکی لێی بێزار بوون و ڕقیان لێی بوو} یانکاش توورە بوو و گوتی:{ئەلفرێدۆ لاسار نییە!} خاتوو ئیزابێلاش گوتی:{بێدەنگ بە یانکا ئەم هەڵسوکەوتە جوان نییە، بەڕێز مالیزیۆ و خاتوو کرازێلا من لەجیاتی یانکا داوای لێبووردنتان لێ دەکەم کەمێک هەڵچوو و داواکارم بەردەوام بن لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە لە ڕووانگەی خۆتانەوە چونکە ئەمە مافی خۆتانە، دوای ئەوەش گوێ لە لایەنی دووەم دەگریین چونکە وادەزانم کە ئەمەش مافی خۆیانە ئەی وانییە گەورەم؟} پاشا گوتی:{بەڵێ ئەمانەی تۆ گوتت ڕاست بوون بەڵام ئایا تۆ پارێزەری بەرگری کردنی ئەو منداڵانەی؟} خاتوونیش گوتی:{نەخێر من پارێزەری ئەوان نیم، من تەنها دەمەوێ بگەم بە ڕاستییەکان و پووچەڵییەکانیش ئاشکرا بن، بەڕێزتان یەکسانییتان خۆش دەوێ و هەر ئێوەش ئەمەتان فێر کردووین} پاشا گوتی:{بەڵێ ڕاست دەکەی ئێمە پێویستە بگەینە ڕاستییەکان، دەی بەڕێز مالیزیۆ ئێستاش بەردەوام بە لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە} .

ئەویش گوتی:{ئەلفرێدۆ زۆر ڕقی لە باوکی دەبۆوە بەڵام قەت باوەڕم نەدەکرد کە بگاتە ڕادەی کوشتن، پاشان ئەلفرێدۆ ئاگری لە ماڵەکە بەردا و بەرەو گوندێکی دوور ڕایکرد و پاشان خۆی گەیاندە میلانۆ و ئێستاش لە دوکەڵکێش

پاككردنەوە كار دەكات، ئەمە هەموو بەسەرهاتی من بوو بۆم گێڕایەتەوە}
ئینجا پاسەوانەكان دەستیان كردە پێكەنین بەوەی كە ئەلفریدۆ لە دوكەڵكێش پاككردنەوە كار دەكات ئەلفریدۆ گوتی:{وابزانم ئێستا نۆرەی من هاتووە قسە بكەم، یەكەمجار من شەرم ناكەم كە لە دوكەڵكێش پاككردنەوە كار دەكەم} پاشا گوتی:{لەگەڵ ئەوەش تۆ لە بنەماڵەیەكی بەڕێزی!؟} ئەلفریدۆ گوتی:{بەڵێ من هیچ جیاوازییەک نابینم لە نێوان خانەدانەكان و دوكەڵكێش پاككەرەوەكان، من لە ماوەی ئەم كارەمدا كۆمەڵێک هاوڕێم ناسی كە ڕازاونەتەوە بە خوڕەوشتی بەرز لەگەڵ ئەوەی لە خێزانی هەژارن ئەوان زۆریان لێكراوە ئەم كارە بكەن بەرامبەر بە پارەیەكی كەم، ئێوە پێویستە ئەم منداڵانە لەم ژیانە ناخۆش و پڕ ئازارە ڕزگار بكەن، ئێمە بە درێژایی ڕۆژ كار دەكەین، دوكەڵی دوكەڵكێشەكان جلەكانمان پیس دەكات و دەچێتە ناو قورگمان زۆر جار لێمان دەدەن و هەندێ جاریش بەبێ خواردن دەخەوین لەگەڵ ئەوەش ئێمە هەردەم یارمەتی یەكتری دەدەین و یەكترمان خۆش دەوێت و ئەگەر دڵسۆزی هەندێک هاوڕێ نەبووایە ئەوا زۆرێكمان لەناو دەچووین من ئەو منداڵانەم زۆر خۆش دەوێت و ڕێزیان دەگرم ئەگەر ئەوان نەبوونایە من نەمدەتوانی لە پێش جەنابتان ڕاوەستم ئێستا بۆیە دەڵێم ڕەوشتی بەرز نازناو نییە بەڵكو ئاكاری جوانە من ئەوە بوو دەمویست بیڵێم گەورەم} ئەو قسانەی ئەلفریدۆ زۆربەی خەڵكی ناو كۆشكەكەی گریاند، پاشان بەسەرهاتی دایک و باوكی گێڕایەوە و پاشا گوتی:{ئێستا دوو كەسمان لەبەردەم دایە و هەریەكەیان بە پێچەوانەی ئەوی تر بەسەرهاتەكە دەگێڕێتەوە، هەریەكەشیان دروشمێكی هەڵگرتووە و دەڵێ دروشمی مارتینێزە لەبەر ئەوە دەبێت یەكێكیان ساختە بێت} بەڕێز مالیزیۆ دروشمەكەی برد بۆ پاشا و گوتی:{ئەمە ئەو دروشمەیە كە باوكی ڕەحمەتیت پێشكەشی براكەمی كردبوو} پاشا گوتی:{بەڵێ.. لە كاتی جەنگدا بەڕێز ڤیكتۆریۆ باوكمی ڕزگار كرد، باوكیشم ئەم دروشمەی بە دیاری پێدا، بەڵام باوكم باسی ئەوەی بۆ كردبووم كە نیشانەیەک لەسەر دروشمەكەیە ئایا دەزانی ئەو نیشانەیە چیە؟} .بەڕێز مالیزیۆ واپێدەچوو كە نەزانێت ئەو نیشانەیە چییە و بە سەرسوڕمانەوە گوتی:{نیشانە؟}، ئەلفریدۆ گوتی:{من دەزانم ئەو نیشانەیە چییە گەورەم،، ئەو نیشانەیە بریتیە لەو ئیمزایەی كە باوكی بەڕێزتان لە دواوەی دروشمەكە كردبووی پێش ئەوەی بیدات بە

باوکم، باوکم دڵی بە ئیمزاکە زۆر خۆشتر بوو وەک لە دروشمەکە، ئەوەتانێ نیشانەکە} ئینجا دروشمەکەی خۆی برد بۆ پاشا و پاشا گوتی:{بەڵێ منیش ئەم ڕاستیانەم لە باوکم گوێ لێبووە کەواتە ئەو دروشمەی بەڕێز مالیزیۆ دای بە من ئیمزاکەی پێوە نییە و دروشمێکی ساختەیە} ئیتر هەموو ڕاستییەکان ئاشکرا بوون و مافی ئەلفرێدۆ و یانکا گەڕایەوە بۆیان.
ڕۆمیۆش هەر چاوەڕوانی ئەلفرێدۆی دەکرد تاکو هاتنەوە و هەموویان پێکەوە دەستیان کردە پێکەنین، ئینجا ئەلفرێدۆ و ڕۆمیۆ یانکایان بردەوە بۆ ماڵی دکتۆر کاستێلا و خۆیان چوونە هۆڵی کۆبوونەوەی گشتی بڕیاریاندا کە تێیدا پشوو بدەن و قسەیان دەکرد ئەلفرێدۆ گوتی:{ ڕۆمیۆ تۆ ڕۆژی یەکەمی بەیەک گەیشتنمانت لەبیرە؟} ڕۆمیۆ گوتی:{بەڵێ لەبیرمە لەو ڕۆژەوە بووین بە هاوڕێ من لەو ڕۆژەوە وا هەست دەکەم کە زۆر گەورە بوومە و زۆر شتی باش لە تۆوە فێر بووم} ئەلفرێدۆ گوتی:{تۆش زۆر شتی باشت فێر کردم من زۆر پشت بە تۆ دەبەستم ئازیزم} زۆر قسەیان کرد و ڕۆمیۆ پێی وت کە کاتێ بەهار دەستی پێکرد دەبێ لەگەڵ یانکادا بێن بۆ گوندەکەیان، لەو کاتەدا ئەلفرێدۆ دیسان نەخۆش کەوتەوە ڕۆمیۆ بە ترس و دڵەڕاوکێوە گوتی:{ئەوە چیتە ئەلفرێدۆ؟!! لێرە دانیشە ئێستا دەچم دکتۆر کاستێلا بانگ دەکەم}



ئەلفرێدۆ گوتی:{نا ڕۆمیۆ گیان! توخوا لەم ساتە ناسکەدا بەجێم مەهێڵە من دڵنیام لادێکەی تۆ جوانە بەڵام من ئێستا
ماڵئاوایی لەم ژیانە دەکەم} ڕۆمیۆ فرمێسک بە چاوانیدا هاتە خوارەوە و گوتی:{نا ئەلفرێدۆ من و تۆ پەیمانمان دا لە یەکتر جیا نەبینەوە، پەیمانمان دا کە کاتێک گەورە بووین ئەو خەونە جوانانە بکەینە ڕاستی لەبەر خاتری هەموو ئەو منداڵانەی کە لە دوکەڵکێش پاکردنەوە کار دەکەن} ئەلفرێدۆ گوتی:{داوای لێبوردن دەکەم کە ناتوانم ڕێگاکەت لەگەڵ تەواو بکەم} ڕۆمیۆش ڕووی کردە ئەولاوە و فرمێسک وەکو باران لە چاوانی دەتکایە خوارەوە ئەلفرێدۆ هەستایە

پێوه و له بەرامبەر ڕۆمیۆ ڕاوەستا و گوتی:{ڕۆمیۆ گیان ئێمه هەمیشه لەگەڵ یەک داین ئەگەر دووریش له نێوانماندا زۆر بێت تۆ له من تێدەگەیت برا گیان؟} ڕۆمیۆ گوتی:{تێدەگەم هەمیشه لەگەڵ یەکدا دەبین} ئینجا داوای له ڕۆمیۆ کرد که یانکای خوشکی بپارێزێت،پاشان ماڵئاوایی لەو ژیانه جوانه کرد و بۆ بەیانی ئەو هەواڵه گەیشته لای هەموو منداڵەکان تەنانەت دەستەی گورگەکانیش زۆریان پێ ناخۆش بوو ئینجا دەستەی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان به هەوڵێکی زۆر ڕۆمیۆیان کردە سەرۆکی دەستەکەیان، ئیتر ڕۆمیۆ چوو پارەی کۆکردەوە بۆ ئەوەی گیانی پاکی ئەلفرێدۆ به خاک بسپێرن چونکه ئەوە وەسیەتی خۆی بوو که دەبێ له خۆڵدا بینێژن، له پرسەکەدا هەموو هاوڕێیانی دوکەڵکێش پاککەرەوەکان ئەم گۆرانییەیان گوت:

**ئێمەی هاوڕێیان، هەموو وەک براین هاوڕێی خۆشەویست، بۆ یەک بوین به ویست**
**بۆ یەکتری، ئێمه هەموومان خۆشی ئەخوازین، بۆ هەموو جیهان**
**فرمێسکی چاوی ئێمه بۆ هاوڕێمان ئەڕژێ بۆ ئاودانی دڵی ئێمەی پڕ له خەم**
**به یەک دەنگ و توانا هەر هەموو هاوکار و هاوسەنگین دوو به دوو**
**هێی هێی هێی هێی هێی هێی**
**ئێمەی هاوڕێیان، هەموو وەک براین هاوپشت بەوەفا، ئەژین وەک برا**
**ئەلفرێدۆ، زۆر خۆشەویستە به ڕەوشتی جوان و بەرزی تۆ**
**ئەتکەین به وانەی ژینمان ئەمێنی له دڵمان**
**تۆ گەشاوە بووی به خۆشیەکان**
**به یەک دەنگ و تونا هەرهەموو هاوکار و هاوسەنگین دوو به دوو**
**هێی هێی هێی هێی هێی هێی**

ئیتر لەو ڕۆژەوە ڕۆمیۆ بڕیاری دا که هەرگیز نەگری لەبەر ئەوەی ئەلفرێدۆی هاوڕێی هەرگیز نەدەگریا، پاش چەند ڕۆژێک تیپێکی شانۆ هاتنه میلانۆ هاوڕێکانی ڕۆمیۆ حەزیان دەکرد بۆ سەیری نمایشی شانۆکه بڕۆن بەڵام پارەیان پێ نەبوو، لەوکاتەدا میشۆک باسی ئەو ملوانکەکەیەی بۆیان دەکرد که دایکی به دیاری پێی دابوو، ڕۆمیۆ بڕیاری دا کار بکات بۆ کۆکردنەوەی

پارە هەتاکو هاوڕێ خۆشەویستەکانی ببات بۆ نمایشەکە، هەربۆیە دەستیکرد بە خاوێن کردنەوەی ئەو ماڵی خانمێک کە زۆر پیس بوون بە هۆی ئەمەش خانمەکە بە پێی پێویستی ڕۆمیۆ پارەی دەداتێ.



پاش چەند ڕۆژێک کاتێک ڕۆمیۆ لە کارەکەی تەواو بوو خاوەنی ماڵەکە پارەکەیدا بە ڕۆمیۆ، بەڵام هەر ئەو ڕۆژە میشۆک بە ڕێگادا دەڕۆیشت خۆی دابوو لە گۆزەیەک و شکاند بووی، خاوەنی گۆزەکان لە بەرامبەر پارەی گۆزە شکاوەکە ملوانکەکەی میشۆکی برد، کاتێک ڕۆمیۆ بەمەی زانی ڕۆیشت بەو پارەیەی بۆ سەیری نمایشەکە کۆی کردبۆوە ملوانکەکەی بۆ میشۆک کڕیەوە، کاتێک چووە لای هاوڕێکانی بەسەرهاتەکەی بۆیان گێڕایەوە، ئیتر هەموویان چوونە لای میشۆک و ملوانکەکەیان دایەوە پێی، زۆر دڵی پێخۆش بوو، ئەو شەوە هەموویان بەیەکەوە کۆبوونەوە و هەریەکە و باسی بەسەرهاتێکی خۆی دەکرد، ئەو شەوەیان زۆر بە خۆشی بردە سەر.
هاوین هات،بەڵام ڕۆمیۆ کاتێک لەسەر دوکەڵکێشی ماڵێک بوو کەوتە خوارەوە قاچێکی شکا، دکتۆر کاستێلا داوای لە ڕۆمیۆ کرد کە لە ماڵی ئەوان بمێنێتەوە هەتاکو چاک ئەبێتەوە، ڕۆمیۆ ئەو ماوەیەی بە هەل زانی بۆ ئەوەی کتێب بخوێنێتەوە و زۆر باش لە زانست تێگەیشت دکتۆر کاستێلا زۆر یارمەتی ڕۆمیۆی دەدا پاش چەند ڕۆژێک ڕۆمیۆ چاک بووەوە و زۆرباشیش فێری خوێندنەوە و نوسین ببوو.
بەهار هات، کاتی ڕۆیشتنەوەی ڕۆمیۆ و هاوڕێکانی بۆ لادێکەیان و ناو خێزانەکانیان نزیک بووەوە، ئینجا ڕۆمیۆ خوداحافیزی لە بەڕێز ڕۆسی و خاتوو ئیدا و ئەنجلیۆ کرد، پاشان ڕۆیشت خوداحافیزی لە دەستەی گورگەکان کرد،بینی نیکیتا گوڵێکی لە پرچی داوە، ڕۆمیۆ لێی پرسی:{ نیکیتا تۆ زۆر جوانیت بەڵام بۆچی ئەم گوڵەت لە پرچت داوە؟}نیکیتاش گوتی:{ئەلفریدۆ داوای لێکردم کە ئەم کارە بکەم،ئەو ڕۆژێک پێی گوتم:(نیکیتا

تۆ بۆچی دەتەوێ وەکو کوڕێک بژیت؟ ئەزانی ئەگەر ئێستا گوڵێک لە پرچت بدەی زۆر جوان دەبی هەروەکو گوڵ) منیش داواکەییم بەجێ هێنا} ئینجا هەموویان خوداحافیزیان لە دەستەی گورگەکان کرد و سواری گالیسکەکەی دکتۆر کاستێلا بوون و ڕۆیشتنەوە بۆ گوندەکانی خۆیان، یانکاش لەگەڵیان هاتبوو تاکو خوداحافیزیان لێ بکات، کاتێ دکتۆر کاستێلا هەموو منداڵەکانی گەیاندەوە گوندەکانی خۆیان ئینجا نۆرەی ڕۆمیۆ هات، ڕۆمیۆ گەڕایەوە ناو باوەشی گەرمی دایک و باوکی و گوندە جوانەکەی.
چەندین ساڵ تێپەڕی، ڕۆمیۆ گەورە بوو و یانکای کردە خێزانی خۆی و منداڵێکیان بوو ناویان نا ئەلفرێدۆ، ڕۆمیۆ بووە ماموستای گوندەکەیان و منداڵەکانی ناو گوندەکەیانی فێری خوێندنەوە و نوسین دەکرد، بەم شێوەیە ڕۆمیۆ توانی ئاواتی ئەلفرێدۆی هاوڕێی بهێنێتە دی.

**سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :**

**١. کەناڵی ئاسمانی space toon٢، بەشی بەرنامەی منداڵان.**

**٢. پێگەی ئەلیکترۆنی www.**

**سوپاس و پێزانین بۆ سەنتەری بەهرە کە چاپی ئەم پەرتوکەیان گرتەئەستۆ**